## بۆچی فەلسەفە؟



بە درێژایی ئەو مێژووەی، کە مرۆڤ شارستانی تێدا بنیاتناوە، هەمیشە بۆ کردن یان نەکردنی هەرکارێک و ڕامان لە پرسە جیاوازەکانی وەک ڕەوشت، ئاکار، ویژدان، پرسی بوون و مردن، ڕەوایەتی، ماف و یەکسانی. پرسیار گەلێکی لە خۆی کردووە، هەر شارستانیەتێکیش لە جیهاندا سەری هەڵدابێ، هەردەم لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدا بووە بە شێوەیەک لە شێوەکان، وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە. تاکە ڕێگەیەکیش وەڵامی ئەم پرسیارانەی پێدابێتەوە، فەلسەفە بووە.

فەلسەفە چەمکێکی یۆنانیە و لە هەردوو وشەی «فیلو» و «سۆفیا» پێکهاتووە. فیلۆ بە مانای عەشق و مەحبەت، (فیلۆ، دیسان بەمانای هاوڕێیەتیش دێت) سۆفیا، بە مانای مەعریفە، زانین. کە پێکەوە، مانای خۆشەویستی زانین(زانین خۆشویستن و هاوڕێیەتی زانین) دەگەیەنێت. گەرچی مێژووی بیرکردنەوەی مرۆڤ، هێندەی پەیدابوونی بوونەوەری مرۆڤ کۆنە و مێژووی شارستانیەتیش بۆ پێنچ تا دە، هەزار ساڵ لە مەوبەر دەگەڕێتەوە، بەڵام تۆمارکردنی مێژووی فەلسەفە بۆ 2600 ساڵ دەگەڕێتەوە. یۆنانیەکان یەکەم کەسانێك (گەلێك) بوون مێژووی فەلسەفەیان تۆمارکردووە. هەرچەندە شارستانیەکانی میزۆپۆتامیا، چین و مایا (لە ئەمریکای لاتین)، مێژووەکەیان بۆ پێنج هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو کلتورانە تۆماری فەلسەفییان نیە و بۆچوون و ڕاڤەکردنیان بۆ ژیان و دنیا، تەنها لە ڕوانگەی دینیەوە بووە. هەر بۆیە لە ڕووی زانستیەوە تەنها یۆنانیەکان بە داهێنەر و تۆمارکارانی بیری فەلسەفی دادەنرێن.

بۆ تێگەیشتنی فەلسەفەی یۆنانیش، دەبێت سەرەتا بگەڕێینەوە بۆ میتۆلۆجیای یۆنانی و لە دەروازەی میتۆلۆجیاوە بچینە دنیای فەلسەفەی یۆنانی و فەلسەفە بە شێوەیەکی گشتی.

بەر لە مێژووی فەلسەفە، یۆنانیەکان (گشت ئەو شارستانیانەی دیکەش) لە ڕێگەی مێتۆلۆجیاوە (ئەفسانە) ڕاڤەی جیهان و دیاردەکانی سروشت و ژیان و بوونیان دەکرد. لە مێتۆلۆجیادا خواوەندەکان و قارەمانەکانیش، لە چەقی ڕوداوەکاندان و هەر ئەوان بڕیاردەرن، مرۆڤ لە ملکەچی بۆ

فەرمانی ئەوان، ڕۆڵێکی دیکەی نیە و چارەنووسیشی هەر وا بەدەست ئەوانەوە.
ئەوە لە بەخشندەیی خواندەکانەوە بوو کە مرۆڤ دەیتوانی بژی و بخوات و بزێ. خۆ گەر ئەوان توڕەبوونایە، ئیدی کارەسات دەقەوما و ژیانی مرۆڤ و جیهانیش دەکەوتنە مەترسی لەناوچوونەوە. جا بۆ ڕازیکردنی ئەوان، دەبوو پەرستگا دروست بکەن و(ڕیتواڵ) ڕێوڕەسمی پەرستن و قوربانیکردنیش پەیڕەو بکەن. یۆنانیەکان پەرستگەیان بۆ خواوەندکانیان بنیاتناوە و هەر خواوەندە، پەرستگە و پەیکەری تایبەتی خۆی هەبووە. هەرچی جوانی و دزێویش هەبووە هەر داویانەتە پاڵ خواوەندەکان، هەر لە پشکوتنی خونچەیەکەوە، تا هەرەسی کێوێک.
ئیدی ئەوان ئاگایان لە ورد و درشتی ژیانی مرۆڤ هەبووە، هەرلە ڕازی نێوان دوو دڵدارەوە، تا پیلان و پلانی پادشاکان بۆ هاتنە سەر کورسی دەستەلات و سەرکەتن لە جەنگدا. وەنەبێت خواوەندەکانیش هەروا سەلار و بێ کێشە بووبن، نا، ئەوانیش هەردەم خەریکی پیلانگێڕی و ئێرەیی بە یەکدی بردن بوون.
تەواوی ئەم ئەفسانە و بەسەرهاتانە لە دووتوێی دوو داستانە شیعریەکانی هۆمێرۆس دا ئێلیادن و ئۆدیسیەن دا دەخوێنینەوە.
ساڵانی 600 ی پێش مەسیح (پ.م) گۆڕانێک ڕوویدا. ئا لەو سەردەمەدا ئیدی ئەفسانە و داستانەکان ئەو گرنگیەی جارانیان نەما بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی دیاردەکانی سروشت و ژیان. خواندەکان پێگەی خۆیان لە دەستدا و ڕامان و لێکۆڵینەوە لە سروشت و دیاردەکانی، جێگەیانی گرتنەوە. (لۆگۆس) ڕاڤەی لۆجیکانە و عەقڵیانە بۆ دیاردەکان، جێگەی (میتۆس)ڕاڤەی خواوەندانە و شاعیرانە بۆ دیاردەکان)ی گرتەوە.
بەواتایەکی دیکە، ئیدی دیاردەکان تەنها لە توانا و دەستەڵاتی خواوەندەکانەوە نەدەبینرا، بەڵکو لە هۆکارە سروشتیەکانی هەر دیاردەیەک دەکۆڵینەوە. ئیدی ئەم کەسانە لەم قۆناغەدا بە فەیلەسوف، یان فەیلەسوفە سروشتیەکان ناودەبران. هەر ئەم فەیلەسوفانە گۆڕانکارییەکی قوڵیان لە کلتور و پەیڤەکانی زماندا، بەرپا کرد.
کاتێک ڕوانگەی فەلسەفیانە دێتە ئەفراندن، کە لە ڕەهەند و دیدگایەکی عەقڵانیەوە، نەک دینیەوە، هەوڵی ڕاڤەکردن و تێگەیشتنی ژیان،

هەڵسوکەوت، دەوروبەر (دنیا) و مردن، بدەین. بە واتایەکی دیکە، ڕوانگەی فەلسەفی خۆی بە دنیای هۆشەکی و هەمەکی، یان ماتریاڵی و گیانەکیەوە سەرقاڵکردووە و لە بوون و جیهان دەڕوانێ.
خودا و دین، ناچنە ژێر ڕکێفی فەلسەفەوە. گەرچی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا فەلسەفە لە خزمەت ڕاڤەکردنی دیندا بەکاردەهێنرا و دین و فەلسەفە تێکەڵ کرابوون. وەک ئەوەی تۆماس ئەکویناس(1225 -1174) کردی، بیروڕاکانی ئەریستۆتێلیس (384 - 322 پ.م.) ی بۆ ڕاڤەکردنی ئاینی مەسیحی (کریستیانەتی) بەکاردەهێنا.
گەر لە خۆمان بپرسین، ئایا هۆش بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە؟ یان ئەوە تەنها هەستەکانمانە جیهانی دەرەوەمان پێ دەناسێنێت، تا بابەتەکان دەقاودەق وەک خۆیان ببینین، یان وەک ئەوەی خۆیانمان بۆ دەردەخەن و خۆمان بە هیچ ڕاڤە و پێشمەرجێکەوە نەبەستبێتەوە.
خۆگەر لە بابەت بڕوانین، ئەوا دەبێت تەنها خەسڵەتە چەسپاو و نەگۆڕەکانی بابەت ببینین و لە شیکارکردنیاندا، گوێ بە هەستەکانمان نەدەین. گەر هەوڵی وەدەستهێنانی زانیاریش بدەین، ئەوا هۆش و جیهانی دەرەوە و بیر، هەرسێکیان گرنگن و بە نەبوونی یەکێ لەم خاڵانە، زانیاریش پەیدا نابێت.
کێ دەڵێ جیهانی دەرەوە (دەرەوەی هەستی مرۆڤ) بوونی هەیە؟ کێ ناڵێت، جیهانی دەرەوە تەنها کۆمەڵێ دیاردەی هەستیی هەمەکی نین؟ یان، تەنها کۆمەڵێ دیاردەی هۆشی، هەمەکی نین؟
چۆن بزانین بابەتەکان/شتەکانی دەوروبەرمان بوونێکی ڕاستەقینەیان هەیە و کۆپی کۆمەڵێک ئایدیا /بیر، نین و خودی خۆیان لە جێگەیەکی دیکەن!
گەر باسەکە بهێنینە سەر خودی مرۆڤ و مرۆڤ بکەینە "پێوەری گشت شتێک". ئەوا دەبێت لە خۆمان بپرسین، ئایا بوون (بوونی مرۆڤ) بنەڕەتی گشت جەوهەرە ماتریاڵی و گیانەکیەکانیشە، تەنانەت ڕاستەقینەش/حەقیقەتیش، بەبێ بوون نابێ و نیە؟
تۆ بڵێیت بوون لە جیهانی فۆرمالیستیانە و نۆمینەدا، بەرز و ڕەها (تراسێندانتاڵ) بێت، یان تەنها بوونێکی میتافیزکیانەی نەریتیانەیە؟
خۆ گەر بوون بخەینە پاش هەبوونی جیهانی ئایدیاوە، ئەو کاتە

جینسێکی لە خۆی گەورەترمان داوەتێ و دەشێ بە بوونێکی لە خۆی (لە بوون) گەورەتر بەراوردی بکەین. بەڵام گەر لە ڕوانگەی بوون خۆیەوە بۆ بوون بڕوانین و هیچ جینسێکی لە بوون گەورەتر و لە پێشتر ناس نەکەین، ئەوا بنەڕەتێکمان داوە بە بوون. کە لە بنەڕەت بەدەرە.

چەمکی مەرگیش، هەر لەگەڵ پەیدابوونی مرۆڤەوە بۆتە نهێنییەک بۆی و پەیبردن بە کۆدەکانی، خستویەتە ناو دەریای بێ بنی ئەندێشەوە و بە جۆرەها شێوە هەوڵی شکاندنی ئەو کۆدانەی داوە و هەمیشە نیگەران بووە تا ڕاڤەیەکی لۆژیکیانەی بۆ بدۆزێتەوە.

نیگەرانی، خەسڵەتێکی سروشتی، یان *"فەلسەفی"* مرۆڤە. لەبەرئەوەی هیچ پێشمەرجێک بۆ بوونی مرۆڤ نیە، ئەوا، مرۆڤ ئێستا و لێرە دەژی و هەوڵی تەواو کردنی خۆی دەدات. ئەم هەوڵی خۆ تەواوکردنە، هەمیشە نیگەرانی کردووە - دەکات.

نیگەرانی مرۆڤی " *ناچارکردووە* " مانا بە ژیان ببەخشێت. بۆ ئەفراندنی ئەو مانایەش، دوو هۆکاری بەکارهێناوە. هونەر و زمان/ پەیڤ.

لە ڕێگای هونەرەوە، دەتوانین نیگەرانی و هەستی نامۆییمان بڕەوێنینەوە و پەی بە دیوە شاردراوە و پڕ لە نهێنیەکەی ژیان ببەین.

لە ڕێگەی زمانەوە دەتوانین مانا بە شتەکان ببەخشین و بەرجەستەیان بکەین.

ئەم حەوت وانەیەی وا لەتوێی ئەم کتێبەدا، دڵۆپێکە لە دەریای فەلسەفە، بەڵام خۆ دەکرێ دوای خوێندنیان لە خۆمان بپرسین، ئایا فەلسەفە مانای ئەوەیە بە پێچەوانەی گشت خەڵکەوە بیربکەینەوە؟ یان ئامانجی فەلسەفە ئەوەیە کە ئەو کاتانەی ژیان بێ تام و ساتەکان خاڵین لە مانا، ئارام بە دەروون و گیانمان ببەخشێت؟

گەر نەتوانین پرسیاری لەم جۆرە لە خۆمان بکەین ئەوا بێگومان پێویستمان بە فەلسەفە نیە!

کەریم مستەفا
ئۆسلۆ، هاوینی 2006

ئەم کتێبە بۆ خوێندکارانی پۆلەکانی قۆناغی ناوەندی نووسراوە



## ئامانج لەم کتێبە

لەم کتێبەدا هەر چیرۆکێک باس لە یەکێک لەو بوارانە دەکات، کە فەلسەفە هەمیشە پێوەیان سەرقاڵ بووە، یان بە واتایەکی دیکە، جێگەی خۆیان لە ریزەکانی پێشەوەی پرسیارگەلە فەلسەفیەکاندا بووە، لەوانە، رێسا و یاسا، رەوایەتی و نارەوایەتی، راستی و ناراستی، هونەر، جوانی (جوانی سروشت و مرۆڤ)، یەکسانی، بەها، ئاکار، بیر، لۆجیک و....

ئامانج لەم کتێبە، ئەوە نیە منداڵان و خوێندکارانی ئەو قۆناغانە بکات بە فەیلەسوف، بەڵکو ئامانج ئەوەیە، بە بیرکردنەوەی فەلسەفیانە رایانبهێنێت و کەمێ بە مێژووی فەلسەفە ئاشنایان بکات. بە واتایەکی دیکە، وایان لێبکات لە روانگە و رەهەندگەلی جیاوازەوە کێشەیەک، پرسێک، یان رووداوێک، شی بکەنەوە و پرسیار لە مەڕ ئەو کێشە و پرس و رووداوانە بکەن، و بە راوبۆچوونی خۆشیان وەڵامی «ئەگەری» بۆ ئەو پرسیارانە بدۆزنەوە.

## کێ دەتوانێت ئەم کتێبە بەکاربهێنێت؟

مامۆستا و وانەبێژی ئەو قۆناغەی خوێندن، باوان (دایک وباوک)، سەرپەرشتکار و راهێنەرانی ئەو سەنتەرانەی خوێندکار و منداڵان لە کاتی پشوی خوێندندا رویان تێدەکەن.

مەبەستی سەرەکی ئەوەیە کە ئەم کتێبە (وەک هەنگاوێکی سەرەتایی لەم بوارەدا) لەو قۆناغانەی خوێندن لە خوێندنگەکاندا بەکاربهێنرێت و بە رەسمی جێگەی خۆی لە خشتەی وانەکاندا بۆ دیار بکرێت، (بۆنموونە هەفتەی وانەیەک).

بەڵام دەکرێ لەماڵەوە دوای کاتی خوێندنگا، خوێندکاران خەریکی راهێنانەکانی ناو کتێبەکە ببن، یان وانەبێژ، لە کاتی تایبەتدا (لە خولی راهێزاندا) وەک رێنماییەک بۆ فێربوون و زانینی زیاتر و راهێزان، بەکاری بهێنن.

مامۆستا/وانەبێژ، دەبێت :
- چیرۆکەکان بخوێنێتەوە و تێبینیەکانی خۆی تۆمار بکات.
- پرسیارەکانی دوای هەر چیرۆکێک بخوێنێتەوە.
- خۆی هەوڵی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بدات، بۆ خۆی.
- گەر دوای خوێندنەوەی تێکستەکە پرسیاری لە لا دروست بوو، ئەوا دەبێت لە لای خۆی تۆماری بکات و لە کاتی پێویستدا وەک پرسیاری لاوەکی بیکات.
- بێ لایەنانە (نۆیتراڵ) لە چیرۆکەکان بڕوانێت و بە هیچ شێوەیەک خۆی نەکات بە بەشێک لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکان، یان لە وەڵامەکان.
- بە هیچ شێوەیەک وەڵامی هیچ پرسیارێک لە پرسیارەکانی تێکستەکە، بۆ خوێندکاران نەداتەوە.
- هیچ پرسیارێکی خوێندکاران (لە سوری پرسیار کردندا) ڕەتنەکاتەوە.

## شێوەی بەکارهێنانی ئەم کتێبە

### شێوازی گوتنەوەی وانەکە

خوێندکاران دەبێت بە شێوەی بازنەیی لە پۆلدا دابنیشن، تا گشت چاویان لە ڕوخساری یەکدی بێت. ئەم شێوازە زۆر گرنگە، بە تایبەتی لە کاتی گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەدا. بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ڕووبەری پۆلەکان و زۆری ژمارەی خوێندکاران دەکرێ مێزەکان (ڕەحلەکان) ڕوو وەرگێڕن بە چواردیواری ژورەکەدا، واتە خوێندکاران لەسەر مێزەکان دابنیشن و پێ بخەنە سەر کورسیەکان، بەڵام دەبێت گشتیان ڕوو لە یەکدی بن.
دەبێت مامۆستاش/وانە بێژ لە بازنەکەدا بێت.

### کەرەستەی پێویست.

گەر خوێندکاران ئەم کتێبەیان نەبوو (واتە هەرکەس کتێبی خۆی نەبوو) ئەوا دەبێت هێندەی ژمارەی خوێندکارەکان، یان هێندەی

زۆرماوەی ئەوانەی کە کتێبیان نیە، چیرۆکە کە و پرسیارەکان کۆپی بکەیت و بە سەریاندا دابەش بکەیت.
دەبێت خوێندکاران دەفتەرێکی تایبەت بۆ وانەکە تەرخان بکەن بۆ تۆمارکردنی تێبینییەکانیان دوای خوێندنەوەی چیرۆک و پرسیارەکان و وەڵامدانەوەی ئەو ئەرک و پرسیارانەی کە لە دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکان هەڵدەهێنجرێن و چڕ دەکرێنەوە.

## هەر وانەیەک بە 3 قۆناغ دەگوترێتەوە

(هەر وانە و چیرۆکێک 3 سەعات، یان 3 وانەی دەوێت.)

## قۆناغی یەکەم:

کاتی پێویست بۆ هەر وانەیەک (45 دەقیقەیە)

- 3 تا 4 دەقیقە بۆ سازکردنی مێزەکان (ڕەحلەکان) و دابەشکردنی کۆپی تێکستەکان، بەسەر خوێندکاراندا.
- خوێندنەوەی چیرۆکی هەر وانەیەک لە 3 بۆ 5 دەقیقە دەخایێنێت.
- پشویەک بۆ بیرکردنەوە لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە 2 تا 3 دەقیقە.
(لەم کاتەدا دەبێت خوێندکاران بە تەواوی بێ دەنگ بن و بیر لە چیرۆکەکە بکەنەوە)
- سوڕی پرسیاری خوێندکارن 7 تا 10 دەقیقە. پرسیارکردن بە نۆرە. لە کاتی پرسیارکردنی خوێندکاراندا مامۆستا-وانە بێژ پرسیارەکان لەسەر تەختە ڕەش دەنووسێتەوە و ناوی کەسی پرسیارکەریشی لە پاڵدا دەنووسێت. گەر خوێندکارێک پرسیاری نەبوو، یان نەیویست کۆمێنتارێک/شتنێک، بڵێت، مامۆستا/وانەبێژ، دەبیت بەسەریدا تێپەڕێت و لە کەسی دوای ئەو بپرسێت، بەڵام گرنگە مامۆستا-وانەبێژ، تێبینی بکات، کە ئەو خوێندکارەی لەم وانەیەدا بەشدار نەبووە، دەبێت لە وانەی، یان وانەکانی داهاتوودا بەشداری بکات، هەروەها دەبێت خوێندکاران لەم ماوەیەدا ئاگایان لەسەر تەختە بێت و پرسیارەکان لای خۆیان تۆمار بکەن. لەوانەیە لە پۆلێکی 25 کەسیدا، 10 تا 15 خوێندکار لە وانەیەکداچالاکبن.

مامۆستا - وانەبێژ، نابێت هیچ پرسیارێک ڕەتبکاتەوە.
- پشوویەکی 2 تا 3 دقیقە، بۆ تێڕامان لە پرسیارەکان.
- چڕکردنەوەی پرسیارەکان بۆ 3 تا 5 پرسیار (لە 3 پرسیار کەمتر نەبێت و لە 5 پرسیار زۆرتر نەبێت) واتا هەڵبژاردنی ئەو پرسیارانەی کە بەڕای زۆرینە گرنگترن. ماوەی 5 دەقیقەش بۆ ئەم کارە دابنێن.
- ماوەی 10 دەقیقە بۆ گفتوگۆ و تێبینی خوێندکاران لە مەڕ پرسیارەکانی خۆیان تەرخان بکەن. (واتە هەریەکێ لەو کەسانەی پرسیاریان کردووە، دەتوانن زیاتر ڕوونی بکەنەوە، کە مەبەستیان لە پرسیارەکە چیە)
- 5 دەقیقەی کۆتایی، بۆ پێدانی ڕاهێنان بۆ ماڵەوە و ڕێکخستنەوەی ڕەحلەکان.

ڕاهێنان بۆ ماڵەوە
لە کۆتایی هەر وانەیەکدا، ڕاهێنان بدە بە خوێندکاران تا لە ماڵەوە تەواوی بکەن.
- تێگەیشتن و تێڕوانینی خۆیان لەمەڕ چیرۆکەکە بە چەند دێڕێک بنووسن 5 تا 10 دێڕ زیاتر نەبێت.
- وەڵامی سێ پرسیار بدەنەوە.
- زانیاری دەربارەی فەلسەفە بە گشتی و ئەو فەیلەسوفەی/ فەیلەسوفانەی لە وانەکەدا ناوی/ ناویان دێت و چ کتێب و نووسراوێکی هەیە/ هەیانە، کۆبکەنەوە و تۆماری بکەن.

قۆناغی دووەم:
تەواوکردنی وانەکان

- لە قۆناغی یەکەمدا بەو شێوەیەی کە ڕوون کرایەوە، وانەکە دەگوترێتەوە و ڕاهێنان دەدرێت بە خوێندکاران.
- لە وانەی دووەمدا، بە هەمان شێوەی وانەی یەکەم، 5 دەقیقەی سەرەتای وانەکە بۆ ڕێکخستنی مێزەکان بە شێوەی بازنەیی تەرخان

دەکرێت، تا خوێندکاران ڕوخساری یەکدی ببینن. لەم ماوەیەدا مامۆستا/ وانەبێژ، ڕاهێنانی ماڵەوە، بەسەر دەکاتەوە.

- مامۆستا/ وانەبێژ، ماوەی10دەقیقە بۆ پێداچوونەوە و بیرهێنانەوەی چیرۆکی وانەی پێشوو، هەروەها ئەو پرسیارانەی دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکە کراون و 3 یان 5 پرسیارە هەڵبژێردراوەکە، بەکاردەهێنێ.

- 2 تا 3 دەقیقە پشوو، بە بێدەنگی بیرکردنەوە لە چیرۆکەکە و لە پرسیارەکان.

- 15 دقیقە بۆ ڕاڤەکردنی پرسیارەکان (3 یان 5 پرسیارەکە) تەرخان دەکرێت.

سەرەتا با خوێندکاران بە خواستی خۆیان بەشداربن لە گفتوگۆکاندا، گەر کەس دەستپێشخەری نەکرد، مامۆستا بەپێی لیستی ناوەکان داوا لە خوێندکاران دەکات تا لە گفتوگۆ و وەڵامی پرسیارەکاندا بەشدار بن. دیسان گەر خوێندکارێک نەیویست لە وەڵام و گفتوگۆدا بەشدار بێت، با مامۆستا بەسەریدا تێپەڕێت، بەڵام زۆر گرنگە کە مامۆستا تێبینی ئەو خوێندکارە بکات و لە وانەکانی داهاتوودا بەشداری پێبکات. بۆیە دەبێت، ناوی ئەو کەسانەی لە هەر وانەیەکدا بەشداری دەکەن و چالاکن، لە لای خۆی تۆمار بکات.

- 5 تا 7 دەقیقە بۆ خوێندکاران تا باسی ئەو زانیارییە بکەن کە دەربارەی فەیلەسوف یان فەیلەسوفەکانی پەیوەندیدار بە چیرۆکەکەوە، پەیدایان کردووە.

- 5 دەقیقەقە بۆ دابەش کردنی ئەو لیستەیەی مامۆستا خۆی ئامادەی کردووە، دەربارەی ژیان و کتێب و نووسراوەکانی فەیلەسوفەکە/ فەیلەسوفەکانی کە لە وانەکەدا ناوی/ ناویان هاتووە.

## قۆناغی سێیەم:

مێژوو

کۆتایی هەر وانەیەک بە کورتەیەک لە مێژووی فەیلەسوفەکە/ فەیلەسوفەکان کۆتایی دێت. کورتەیەک لە خاڵە گرنگ و

سەرەکییەکانی فەلسەفەکەی/ فەلسەفیەکەیان و زانیارییەکی کورتیش لەسەر ژیانی/ ژیانیان.
(مامۆستا دەتوانێت زانیاری زۆرتر لەسەر مێژووی فەیلەسوفەکە/ فەیلەسوفەکان، بۆ ئەم قۆناغە پەیدا بکات)

## زانیاری زیاتر

- زانیاری زیاتر دەربارەی فەیلەسوفە کە، لیستیک لە بەرهەمە نووسراوەکانی، کتێبەکانی (بە کوردی) لەگەڵ ناوی ئەو دەزگایەی کتێبەکەی چاپ کردووە، یان ناوی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی بابەتیان لەسەر ئەو فەیلەسوفە نووسیوە، یان تەرجەمە کردووە. پەیدا بکە و بیدە بە خوێندکاران.
- گەر بتوانیت وێنەی ئەو فەیلەسوفەی/ فەیلەسوفانەی کە بیرۆکەی چیرۆکەکەی لێ وەرگیراوە، لەگەڵ کتێبێکیدا/ کتێبێکیاندا، پەیدا بکەیت و لە پۆلدا لە کاتی گوتنەوەی وانەکەدا، نیشانی خوێندکارانی بدەیت. ئەم شێوازە، یارمەتی خوێندکاران دەدات تا لە بیر وبۆ چونی فەیلەسوفەکە/ فەیلەسوفەکان زیاتر نزیک ببنەوە.

## پرسیار

لەگەڵ هەر چیرۆکێکدا 10 پرسیار داڕێژراوە بۆ زیاتر ڕۆشنایی خستنە سەر ناوەڕۆکی چیرۆکەکە و وروژاندنی پرسی دیکە.
(ئەم پرسیارانە نابنە ڕێگر لە بەردەم پرسیاری خوێندکاراندا. واتە دەبێت هەنگاوی سوڕی پرسیارکردن لە دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکە، پیادە بکەن.)

## بۆچی 7 وانە ؟

بەپێی ساڵنامە لە باشووری کوردستان، لە هەفتەی 37 تا هەفتەی 20 ی ساڵی داهاتوو (تێکڕا 35 هەفتە)، لە 20 ی سێپتەمبر تا 20 ی مای، دەوامی خوێندنگا هەیە. لە ئەنجامی بەدواداچوون و زانیاری ساڵانی پێشوو دەرکەوتووە، کە نزیکەی 12 هەفتە بەهۆی پشووی بڕیاردراو (ڕەسمی) و پشووی لە ناکاو، لە کۆی هەفتەکانی خوێندن دەقرتێنرێت و دەمێنێتەوە 23 هەفتە.

بەگوێرەی ئەو ڕوونکردنەوەیەی لە قۆناغی گوتنەوەی وانەکاندا دراوە، هەر وانەیەک 3 هەفتە دەخایێنێت، واتە گوتنەوەی تەواوی وانەکانی کتێبەکە، 21 هەفتەی پێدەچێت. بەم پێیە 2 هەفتە دەمێنێتەوە، ئەم دوو هەفتەیە بەم شێوەیە بەکار دەهێنرێت:

هەفتەی یەکەم، پێش دەستکردن بە گوتنەوەی وانەکان.

مامۆستا/ وانەبێژ (بێگومان دوای ئەوەی کە کتێبەکەی تەواو خوێندۆتەوە) دەچێتە پۆل و ماوەی 45 دەقیقەی هەیە بۆ ئاشناکردنی خوێندکاران بەم وانە نوێیە و ئامانجەکانی و شێوازی گوتنەوەی وانەکە، هەر لە گۆڕینی شێوازی دانیشتنی خوێندکاران لە پۆلدا و ساتەکانی پشووی بیرکردنەوە، چڕکردنەوەی پرسیار و هەوڵی دووبارە نەکردنەوەی، گوێ لێگرتن و سەرنجدان و تەماشاکردنی، کەسی بەرانبەر (کەسی قسەکەر)، تۆمارکردنی تێبینی و خاڵە سەرەکی و گرنگەکانی چیرۆکەکان و گفتوگۆکانی دوای چڕکردنەوەی پرسیارەکان.

هەروەها زۆر گرنگە خوێندکاران لەوە ئاگادار بکاتەوە، کە دەبێت هەموو بەشداربن، بەڵام مەرج نیە لە هەموو وانەکاندا چالاک و بەشداربن.

دەشێ باس و بابەتی وانە و چیرۆکێک، لەلای یەک، یان چەند خوێندکارێک مایەی سەرنج و گرنگی نەبێت، بەڵام دەشێ لە باس و ناوەڕۆکی وانەکانی دیکەدا باس و بابەتی سەرنج ڕاکێشەر و پرسیار وروژێنەری بۆ ئەو/ ئەوان، تێدا بێت.

(مامۆستا/ وانەبێژ، دەبێت ڕەچاوی ئەو خاڵە بکات، کە هەموو باس و بابەتێک، لای گشت کەسێک، هەمان گرنگی و بەهای نیە!)

دیسان ئەو خاڵەش گرنگە، کە مامۆستا- وانەبێژ، خوێندکاران هانبدات تا خۆیان بە شوێن بەرهەمی نووسراوی فەلسەفی و نووسراوەکانی ئەو فەیلەسوفانەی کە ناویان لەگەڵ چیرۆک و وانەکاندا هاتووە، بگەڕێن و بخوێننەوە و زیاتر لە مەبەست و بۆچوونیان تێبگەن.

هەفتەی کۆتایی، دوای گوتنەوە و تەواوکردنی وانەکان.

لەم وانەیەدا، کە بەپێی بەرنامەی دانراو دەبێت هەر 7 وانەکە بە هەر 3 قۆناغەکانیانەوە گوترابنەوە و خوێندکاران بە دید و بیرکردنەوەی فەلسەفیانە ڕاهاتبن و باشتر لەوە تێبگەن، کە مامۆستا/ وانەبێژ، باس لە چی دەکات.

مامۆستا-وانەبێژ، بە خاڵ و بڕگە گرنگ و سەرەکیەکانی چیرۆک و وانەکاندا بچێتەوە و زۆرتر گرنگی بەو پرسیارە بدات، کە ئایا خوێندکاران هەست دەکەن لە دوای خوێندنی ئەم وانە فەلسەفیانە، ژیرانەتر و بە دیدێکی فراوانترەوە لە خۆیان، لە ژیان، لە کەسانی دیکە، لە کێشە و ڕووداو، لە کارەسات، لە بیر و بۆچوونی جیاواز، لە دەوروبەر، تێدەگەن و دەڕوانن؟
دیسان زۆر گرنگە کە مامۆستا-وانەبێژ، خوێندکاران هانبدات تا لە پشووی هاویندا لە خوێندنەوەی بابەتی فەلسەفی دانەبڕین.

تێبینی بۆ مامۆستا :
لەژێر ئەم بڕگەیەدا، ئاماژەی ئەو بیر و ڕێبازە فەلسەفیە کراوە کە بیرۆکەی وانەکەی لێوەرگیراوە.

## کلتور و کتێبی پەیوەندیدار

کلتور: هەر بابەتێکی دیکە، کە پەیوەندی بە باسەکەوە هەبێت.
کتێبی پەیوەندیدار: لە کۆتایی کتێبەکەدا لیستێک بەناوی ئەو کتێب، گۆڤار، یان گوتارانە هەیە. کە لەو تێڕوانینە فەلسەفیانەوە نزیک بێت، یان بەشێوەیەک پەیوەندییەکی بەو باسەوە هەبێت،.
مەبەست لە کتێبی پەیوەندیدار، هەر کتێبێکە بە زمانی کوردی لە کوردستان چاپ کرابێ دەربارەی فەلسەفە بەگشتی و ئەو بابەتە فەلسەفیەی چیرۆکەکەی لەسەر داڕێژراوە، یان بەشێوەیەک باسی ئەو فەیلەسوفەی کردووە، کە ئایدیای چیرۆکەکەی لێوەرگیراوە.

## وانەی 1

### چیرۆک

# گوڵ فرۆشی

نازدار و خونچە، هاورێ و هاوپۆل بوون، دوای نیوەڕۆیەک لە خوێندنگاوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕانەوە، دیتیان یەکێک لە دوکانەکانی نزیک خوێندنگاکەیان، بووە بە دوکانی گوڵ فرۆشی.

نازدار بە خونچەی گوت:

وەرە با بچین سەیری گوڵ بکەین، ئەها لەسەر تابلۆی ئەو دوکانە نووسراوە گوڵ فرۆشی.

خونچە گوتی:

نازدار، من زۆرم حەز لە گوڵە، بەڵام ئەوە هەر وێنە و پۆستەرە بە جامخانەکەدا هەڵواسراوە و هیچ گوڵ نابینم.

نازدار گوتی:

با بچینە ژوورێ، ڕەنگە جوانترین و بۆنخۆشترین گوڵیان هەبێ

خونچە هیچی نەگوت. بەجووت چوونە ناو دوکانەکە. هەر هێندەی چوونە ناو دوکانەکە، دوکاندارەکە بە ڕویەکی خۆشەوە بەرەوپیریان هات و گوتی:

فەرموون خانمە خنجیلانەکان، چیتان دەوێت تا بۆتانی جێبەجی بکەین؟

نازدار و خونچە لە یەک ساتدا بیریان لەوە کردەوە، کە ئەم دوکاندارە زۆر بەڕێزەوە لەگەڵیان دەپەیڤێ. دیسان بیریان بۆ ئەوە چوو، ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت کە ئێرە دوکانی گوڵفرۆشییە و ئەو کەسەشی لێرە کاردەکات، دەبێت شێوازی ئاخافتنی وەک گول وابێت!

نازدار گوتی:

ئێمە هاتووین سەیری گوڵ بکەین.

خونچە بە نازداری گوت:

نازدار، خۆ یەک تاقە گوڵیش چیە لەم دوکانەدا نیە، تەنها وێنە و پۆستەری گوڵیان هەڵواسیوە.

دوکاندارەکە گوتی:

خونچەکان.........

خونچە قسەکەی پێبڕی و گوتی:

تەنها من ناوم خونچەیە، هاوڕێکەم ناوی نازدارە. بەڵام تۆ چۆن زانیت من ناوم خونچەیە؟

دوکاندارەکە گوتی:

ببورە، من نەمزانیوە تۆ ناوت خونچەیە، بەڵکو من ویستم بە زمانی گوڵ لەگەڵتاندا بدوێم. بەو زمانەش، بە گوڵێک کە هێشتا نەپشکوتبێت و پەڕەکانی پەخشان نەکردبێتەوە، دەڵێن خونچە...

نازدار گفتوگۆکەی پێبڕین و گوتی:

ببورە، ئەی بۆچی گوڵتان نیە؟ تەنها وێنەی گوڵتان هەڵواسیوە. ئایا ئێرە پێشانگای گوڵە، یان وەک لەسەر تابلۆی دوکانەکە نووسراوە گوڵ فرۆشییە؟

دوکاندارەکە گوتی:

بەڵێ گوڵ فرۆشییە، بەڵام گوڵەکان لە باخێکی دوورن. ئەم وێنانەی ئێوە دەیانبینن، وێنەی گوڵە ڕاستیەکانن. هەرکەسێک حەزی لە هەر جۆرێکی گوڵ بێت، بەپێی وێنەکان هەڵیان دەبژێرێت و...

خونچە خۆی پێنەگیرا و گوتی:

بەڵام ئێرە بۆنێکی خۆشی لێدێت، لە بۆنی گوڵ دەچێت!

کابرای دوکاندار گوتی:

بەڵێ ئەوە بۆنی گوڵاوە. دیارە کاتێک گوڵەکان لە جێگەیەکی دوور بن، بۆنەکەشیان ناگاتە ئێرە، بۆیە لێرە گوڵاو دەڕژێنین. گوڵاو و وێنەی گوڵ، وا لە هەرکەسێک دەکات وابزانێت ئەم دوکانە گوڵزارە!

نازدار گوتی:

ئەی چەپکێک گوڵی جوان بایی چەندە؟

دوکاندارەکە گوتی:

من ناتوانم پێت بڵێم بایی چەندە. دەبێت تۆ جۆری گوڵەکان و ڕەنگی گوڵەکان دیاری بکەیت و هەروەها بڕیار بدەیت، ئایا گوڵی بۆندار، یان بێ بۆنت دەوێت. هەروەها ژمارەی چڵەکان و.....

خونچە دیسان گوتەکانی بە کابرا بڕی و گوتی:

زۆر سوپاس بۆ ئەو هەموو زانیاری و ڕوونکردنەوەیە، بەڵام ئێستا ئێمە دەبێت بە پەلە بچینەوە بۆماڵەوە و خەریکی ئەرک و وانەکانمان بین. وانیە نازدار؟

نازدار نەیدەویست دوکانەکە بەجێ بهێڵێت. حەزی دەکرد زیاتر سەیری وێنەی گوڵەکان بکات، جگە لەوەی بۆن گوڵاوەکەش بە جارێ هێزی ڕۆیشتنی لێ بڕیبوو. بەڵام بەبێ دەنگ دوای خونچە کەوت و لە دوکانەکە چوونە دەرەوە، ئەوجا بە خونچەی گوت:

خونچە، سبەینێ هەینیە و پشووە و هیچ ئەرکێکمان نیە. تۆ بۆ نەتهێشت زۆرتر سەیری ئەو وێنانە بکەم، بەڕاستی زۆر.......

خونچە قسەکانی پێبڕی و گوتی:

نازدار، ئەو دوکانە گەورەیە، ئەو هەموو پێشوازیە، دیارە تا چەپکە گوڵێکت بۆ دەهێنن زۆر گران دەکەوێت. جگە لەمانەش کێ دەڵێت گوڵەکان لە ڕاستیدا وەک ئەو وێنانە جوانن؟ ئەی کێ دەڵێت بۆنیان وەک بۆنی ئەو گوڵاوە خۆشە؟ وانیە؟

نازدار هیچی نەگوت و بە بێ دەنگی بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتنەوە.

## پرسیار

ئەمە نموونەی چەند پرسیارێک، با خوێندکارانیش خۆیان پرسیار بکەن

1- ئایا هەموو تابلۆ و نووسینێک، ڕاستی شتەکانمان بۆ دەردەخەن. وەک تابلۆکەی سەر دوکانی گوڵ فرۆشیەکە؟
2- ئایا وێنە، پەیکەر، یان کۆپی هەر "شتێک" دەتوانێت هەمان چێژی "شتەکە" ڕاستەقینەکە بدات؟
3- نازدار، یان خونچە، کامیان «ژیرانە» بۆچوونەکانی خۆیان دەردەبڕن؟
4- تۆ بڵێی کابرای دوکاندار بەڕاستی بێت و گوڵزار و گوڵخانەی هەبێت، خۆ هیچ بەڵگەیەکی نەبوو ڕاستی قسەکانی بسەلمێنێت؟
5- ئایا نازدار کەسێکە «هەستەکانی» بەهێزترن لە «بیرکردنەوەی» و خونچەش کەسێکە بیرکردنەوەی بەهێزترە لە هەستەکانی؟
6- بڵێیت هەموو "شتێک" لەم جیهانەدا کۆپی (وێنەی) شتە ڕاستەقینەکان بن و ئەو شتە ڕاستەقینانەش لە جیهانێکی دیکە بن و ئێمە نەتوانین بیانبینین؟
7- ئایا خونچە درۆی کرد، کە گوتی ((دەبێت خەریکی ئەرکی وانەکانیان بن)) یان ئەوە تەنها هۆیەک بوو تا نازدار لە دوکانەکە دوور بخاتەوە؟
8- گەر نازدار دەیزانی {سبەینێ پشووە و خوێندنگا نیە}، بۆچی بەبێ دەنگ دوای خونچە کەوت و لە دوکانەکە چووە دەرێ؟
9- ئایا دەبێت، یان پێویستە هەموو شتێکی جوان بکڕین؟
10- ئایا خەڵکی دەبێت تەنها لە شوێنی پاک و بۆنخۆشدا بە جوانی بئاخاڤن، یان پێویستە لە هەموو جێگایەک هەر وابن؟

## تێبینی بۆ مامۆستا

بیرۆکەی ئەم چیرۆکە لە بیری (ئایدیای بەرز)ی پلاتۆن وەرگیراوە.

بریبان مەگا:
(( پلاتۆن ڕایەڵەکانی نێوان دنیای بەرزی بیر و مرۆڤی پێکەوە گرێداوە.))

مێژوو



پلاتۆن (427 تا 347 پ.م.)

پلاتۆن، یەکێک لە بە دسپلینترین و نزیکترین شاگرد و هاوڕێی سۆکراتیس بوو. پلاتۆن، بەڕەچەڵەک ئاتێنی و لە خاناوادەیەکی ئاریستۆکرات بوو. ئەم تایبەتمەندێتییە بە بۆچوونە فەلسەفیەکانیەوە بە ئاشکرا دیارە، بەتایبەتی لە پەسنیدانی بە چینی دەستەڵاتدار، یان فەیلەسوفان و بە هەند نەگرتنی مرۆڤی سادە/ بەرهەمهێن و جەنگاوەر، ئەم هەڵاواردنەش لە دابەشکردنی ڕۆڵ و بەرپرسیاریەتی لە بیرۆکەی (دەوڵەت-کۆمار) دا بە ئاشکرا دیارە.
دوای ئەوەی دەستەڵاتدارانی دیموکراتی ئاتێن لە ساڵی (399 پ.م.) دا سۆکراتیان بە مەرگ سزادا، کینەیەکی سەخت لە لای پلاتۆن بەرانبەریان، دروست بوو.
لە ئەنجامی شکستیەکانی ئاتێن لە هەمبەر سپارتەدا، پلاتۆن شاری جێهێشت و ڕویکردە سیسیلی. لەوێ لە کن شا دیۆنیسیۆس بوو بە مامۆستا-و وانەبێژی کورەکەی. دواتر گەڕایەوە ئاتێن و لە ساڵی (358 پ.م.)دا خوێندنگا بەناوبانگەکەی(ئاکادیمیا) دامەزراند.
یەکێ لە ناسراوترین شاگردانی ئاکادیمیا، ئەریستۆتێلیس بوو.
گەرچی خاڵی سەرەکی بیر و بۆچوونەکانی پلاتۆن لە بیرۆکەی دەوڵەت/کۆماردا چڕ بۆتەوە، بەڵام ئەو خاوەنی گەلێ نووسراوی پڕمانا و مەزنە کە تا ئەم ڕۆژگارەش هەر مایەی تێڕامان و مشتومڕە.
نووسراوەکانی پلاتۆن بە «دیالۆگ» ناسراون.

بە بڕوای پلاتۆن، ئەو شتانەی ئێمە دەیانبینین سێبەر، یان وێنەی شتە ڕاستەقینەکانن. فۆرمە ئایدیاڵ و ڕاستەقینەکان، لە دنیایەکی ترانسیێندنتاڵ/بەرزدان بۆ نموونە، گەر تەماشای ئەسپێک، یان درەختێک بکەین، ئەوا تەنها چاو پێویستە بۆ بینینیان، بەڵام گەر بمانەوێت فۆرمە ئایدیاڵەکانیان ببینین، ئەوا «دید/تێگەیشتن» پێویستە.

لە جیهانی ئایدیای پلاتۆندا، فۆرمە هەمەکیەکان پڕ و نەگۆڕن، ئیدی پێویست نیە لەم جیهانەدا گۆڕان ڕوودات. پلاتۆن، تێڕوانینی تایبەتی بۆ جوانی و هونەر هەبوو، جوانی (ئێستاتیکا) بەشێکی گرنگ بووە لە بیرکردنەوەیدا، بەڵام جوانی لە لای ئەو هەر جوانیەکی سادە نیە، ئەویش فۆرمی هەیە.بۆ نموونە، گەر دیمەنی جوانی خۆرنشین، یان ڕەوتی ئەسپێکی ڕەسەن لە کاتی نەرمەغارادا، بۆیە دەیگوت: (( گەر بزانیت جوانی چیە، ئەو کات دەتوانیت وەک فۆرم ڕوبەڕوی ببیتەوە.))

(لەڕاستیدا، ڕوون نیە ئەو فۆرم و ئایدیانەی پلاتۆن باسی دەکات هەن، یان لە کوێن و لە چی دەچن. بۆچی تەنها فەیلەسوفیش نەبێت، کەسی ئاسایی تێی ناگات و نایبینێت؟)

پلاتۆن، لە ساڵی (387 پ.م.) تا دامەزراندنی ئاکادیمیا لە ساڵی(358 پ.م.) دوو جار بە کردەوە هەوڵی بەدیهێنانی بیرۆکەی دەوڵەت-کۆماری داوە. جاری یەکەم لەگەڵ شا دینۆسیسی گەورە لە سیسیلیا. دووەم جار لەگەڵ لەگەڵ شا دێنۆسیسی بچووک لە شیوراکس. هەردوو جارەکە شکستی هێنا، ئیدی دوای ئەوە وازی لەو بیرۆکەیە هانی.

تێکڕا 25 دیالۆگ و 13 نووسراوی فەلسەفی بە ناوی پلاتۆنەوە هەیە.

پلاتۆن بڕوای وابوو، کە فەلسەفە دەبێت بە سێ بەشەوە :

دیالێکتیک، سروشتناسی و ئاکار.

زانیاری تەواو و پڕ لەمەڕ ماتماتیکەوە، بۆ چوونە ناو ئەو جیهانە بەرزەی پلاتۆن گرنکە. بۆیە گتوویەتی:(( کەس بەبێ زانیاری تەواو لە مەڕ ماتماتیکەوە نایەتە ناو ئەم جیهانە.))

گەرچی پلاتۆن، کۆیلەی بە مرۆڤی ناتەواو دەزانی، بەڵام پێیوابوو تەنانەت ئەوانیش دیدی ڕەوانیان بەرانبەر ماتماتیک هەیە. شیعر و دراما لە لای پلاتۆن بەهایەکی ئەوتۆیان نەبووە، گەرچی خۆی سەرەتا

بە شیعر نووسین دەستی پێکرد، هەر بۆیە لە دەوڵەت/کۆماردا هیچ جێگایەکی بۆ شاعیران دانەناوە.
جیهان لە لای پلاتۆن، وەک زانیاریە هەستەکی و هۆشەکیەکانمان دەبن بە دوو بەشەوە.
جیهانی نزم، یان خوارەوە. ئەم جیهانە ماتەرییە و زیندەوەری تێدا دەژی و دەکەوێتە ژێر ڕکێفی کات و شوێنەوە، سەرەتا و کۆتایی هەیە. کۆپی یان سێبەری جیهانە ڕاستەقینەکەیە.
جیهانی بەرز، یان جیهانی ڕاستەقینە، جیهانێکی لە ماتەر بەدەرە و کەوتۆتە ئەودیو سنوری کات و شوێنەوە. ئەم جیهانە تەنها فەیلەسوفەکان دەرکی پێدەکەن و تێیدەگەن.
پلاتۆن بڕوای وابوو، کە ناکرێت زانیاری تەواو لەمەڕ بابەتە هەستەکیەکانەوە پەیدا بکەین و دەکرێ ماتماتیک وەک مێتودێک بۆ ڕاڤەکردنی کێشە فەلسەفیەکان بەکاربهێنین. ئەمەش خاڵێکی دژە بۆچوونی نێوان پلاتۆن و ئەریستۆ بووە.
پلاتۆن، بڕوای بە یەکسانی ژن و پیاو هەبووە، هەر بۆیە لە دەوڵەت/کۆمارەکەیدا دەرفەتی بە ژنانیش داوە، مەشقی وەرزشی و سەربازی بکەن و لە پاراستنی وڵاتدا بەشداربن.
بەڵام پلاتۆن هیچ جێگەیەکی بۆ کۆیلە، لە کۆمارەکەیدا دیاری نەکردووە، گەرچی لە ئاتێن و لەو ڕۆژگارەدا، بە هەزاران مرۆڤی کۆیلە هەبوون. ئەویش وەک گشت خاوەن کۆیلەیەک، مرۆڤی کۆیلەی وەک ئاژەڵ دادەنا.
خۆشەویستی (ئێرۆس/خۆشەویستی خودایی)، لە لای پلاتۆن، هۆکارێکە بۆ ئاسودەبوونی گیان. ئەو کەسەی دوای ئیرۆس دەکەوێت، ژیانێکی ئاسودە و بەختەوەر بەسەردەبات، چونکە ئێرۆس هەوڵدانێکە بۆ گەیشتن بە جیهانی بەرزی بیر. ژیانی ئاسودەش ژیانێکە هاوسەنگ و پەیوەست بە یاسا ئەقڵانی و حەقانیەکانەوە. پلاتۆن مرۆڤی وەک دوو بەش دادەنا، لەش و گیان، بەڵام گیانیشی کردووە بە سێ بەشەوە. حەزکردن، ویست و بیرکردنەوە.
پلاتۆن، فەیلەسوفەکانی پێش خۆی کاریگەرییان لەسەر داناوە. لەوانە: هێراکلیتوس (540 - 475 پ.م.) کە بڕوای بە گۆڕانیکی هەمیشەیی

ەبووە و وەک خەسڵەتێکی تایبەتی گشت "شتەکان" ی دەزانێت. لەم بوارەدا دەڵێت: (( مرۆڤ ناتوانێت دوو جار پێی بخاتە هەمان ئاوی ڕووبارێکەوە.)) بەو مانایەی، هەر هێندە پێی دەرهێنایەوە، ئاوی ڕووبارەکە گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەمەش بنیاتنانی سیستەمی «دیالیکتیک»ە لە فەلسەفەدا. هێراکلیتوس، بڕوای وابوو ((مرۆڤ هۆشیار نیە، بەڵکو هۆش چواردەوری داوە.)).

ئەناکسیمەندەر (610 تا 547 پ.م.) بڕوای وابوو کە توخمی سەرەکی پێکهێنەری گشت "شتەکان" لە ماددەیەکی بنەڕەتی «ئەپیرۆن»ی پێکهاتوون. هەرچی "شت" هەیە ئەپیرۆنە، بەڵام ئەپیرۆن خۆی هیچ کام لەو شتانە نیە، چونکە ماددە، خەسڵەتی تایبەت و«سەرەتا و کۆتایی» هەیە. بەڵام ئەپیرۆن هەمیشە بووە و هیچ خەسڵەتێکی تایبەتی لەناو خۆیدا هەڵنەگرتووە.

سۆکراتیس (470 تا 399 پ.م)

سۆکراتیس مامۆستای پلاتۆن بوو. نزیکەی لە گشت دیالۆگەکانی پلاتۆندا کاراکتێر و قسەکەری یەکەمە. گەرچی سۆکراتیس خۆی هیچ نووسراوێکی لە پاش بەجێ نەماوە، بەڵام لە توێی دیالۆگەکانی پلاتۆندا بیروڕاکانی دەخوێنینەوە. سۆکراتیس، بە یەکەم فەیلەسوف دادەنرێت کە ڕێبازی بیرکردنەوەی فەلسەفەی لە پرسی ڕامان لە سروشتەوە، بۆ ڕامان لە پرسی ڕەوشت و دیدی مرۆڤ، گۆڕیبێت. سۆکراتیس هەردەم دەیپرسی، تەناتەت زۆربەی وەڵامەکانیشی هەر لە شێوەی پرسیاردا بووە. ئەو مەبەستی بووە کەسی پرسیارلێکراو خۆی وەڵام پەیدا بکات. بۆیە سۆکراتیس گوتویەتی: ((خۆت بناسە)).

موغی پەرستگای (ئۆراکیل) سۆکراتیسی بە داناترین پیاوی یۆنان داناوە، کەچی خۆی، هەردەم گوتویەتی ((من دەزانم کە هیچ شتێک بەتەواوی نازانم)). ئەو هەمووو پرسیارکردن، ڕەخنەگرتن و گاڵتەپێکردنەی سۆکراتیس، دەستەڵاتداران و سیاسەتمەدارانی بە جارێ هەراسان کرد بوو. بۆیە تۆمەتی بێ بڕواییان خستە پاڵی و بە ئاژاوەگێڕ و تێکدەری بڕوا و ڕەوشتی لاوانیان دانا. سزای مەرگیان بەسەردا دا. دەبوایە جامیک ژەهر بخواتەوە. گەرچی دەرفەتی ئەوەی هەبوو لە زیندان

ـەڵبێت و لە مەرگ ڕزگاری بێت، بەڵام لە دیدی بڕوابوون بە ڕاستی و لەسەر هەقیی خۆی و لەو ڕوانگەیەوەی کە «بە مردن گیانی لە لەشی ڕزگاری دەبێت و بە نەمری دەمێنێتەوە» سزاکەی بەجێ گەیاند.

(ئا لەم ساتە وەختەوە، ئیدی کێشەی نێوان دەسەڵات و ئینتەلئاکتوێل - ڕۆشنبیر لە مێژوودا، سەرهەڵدەدات) سۆکراتس لەو ڕۆژگارەدا لەگەڵ دوو بەرەدا،بەرەی سۆفیستەکان و بەرەی دەستەڵاتداران، لە کێشەدا بووە، (مەبەست لە دەستەڵاتی کاربەدەستانی شاردەوڵەتی ئاتێنە)

ئەو سزایەی دەستەڵاتدارانی شاری ئاتێن بۆ سۆکراتیان بە ڕەوا بینی بوو، پلاتۆنی کردە دوژمنی دەستەڵاتداران و سیاسەتمەداران، هەربۆیە لە دەوڵەت/کۆمارەکەیدا فەیلەسوفەکان دەبنە ڕێبەری کۆمارەکە.

سۆفیستەکان

گرووپێک فەیلەسوف، یان ڕاستتر مامۆستای فەلسفە بوون. ( وشەی سۆفیست مانای ، زانا، یان داناش، دەدات)، وەک پیشە بە پارە ئەو کەسانەی خوازیاری فێربوونی فەلسەفە، یان هونەری ئاخاوتن بوون، فێری فەلسەفە و هونەری ئاخاوتن دەکرد. بەتایبەتی کوڕانی خێزانە ئەرستۆکراتیەکان، تا بتوانن پلە و پایەی دەوڵەتی بەدەست بهێنن.

پرسی دەستەڵات و کێشەکانی بۆ سۆفیستەکان زۆر گرنگ نەبووە.

سۆفیستەکان گرووپێک بوون کەمێ پێش سۆکراتیس، واتە سالآنی (400 پ.م.) تا دوای مردنی ئەویش، هەر چالاک بوون. سۆکراتس بڕوای وابوو سۆفیستەکان «لۆتین، لۆتی وشە» هەر بۆیە وشەی سۆفیست، تا ئەمڕۆش، لە بواری فەلسەفەدا، مانایەکی نێگەتیڤی هەیە. ئەو دەیگوت:

((سۆفیستەکان بەلایانەوە گرنگە هەقیان بدرێتی،نەک لەسەر هەق بن.))

خاڵی سەرەکی لە فەلسەفە و بیروباوەڕی سۆفیستەکانیشدا ئەوەبوو کە گشت شتێک، تەنانەت ڕاستیش ڕێژەییە. سۆفیستەکان ڕێبازی بیری فەلسەفییان گۆڕی، لە بیرکردنەوە و ڕامان لە سروشت و دیاردەکانی، بۆ ڕامان لە خودی مرۆڤ، هەر ئەم ڕێباز و دیدەش بوو کە سۆکراتیس پەیڕەوی دەکرد، کەچی هەردەم خۆی بە دوژمنیشیان دەزانی.



## پرۆتاگۆراس (485 تا 410 پ.م.)

بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەو گروپە بوو، پرۆتاگۆراس گوتویە ((مرۆڤ پێوەری گشت شتێکە)). چ پلاتۆن و چ ئەریستۆتێلیس، ئەم گوتە و دیدەیان بە «ڕێلەتیڤیزمی ڕیزپەڕ» لە قەڵەمداوە، بە واتایەکی دیکە، ئاگامەندی دەبێتە پاشکۆی بابەت، واتە بابەتی ئاگامەندیەکە.

## جۆرجیاس (483 تا 376 پ.م.)

جۆرجیاس (483 تا 376 پ.م.) هاوسەردەمی پلاتۆن بووە. وانەبێژ و پێداگۆگێکی زۆر بە توانا بووە. کتێبێکی نووسیوە، تیتڵێکی زۆر سەرنجراکێشی هەبووە (دەربارەی ئەوشتەی کە نیە، یان دەربارەی سروشت)، لەو کتێبەدا سێ بابەتی هورووژاندووە:

1- کە هیچ "شتێک"، بوونی نیە/وجودی نیە!
2- گەر شتێکیش هەبێت، ئەوا ناکەوێتە بەر ئاگامەندی مرۆڤ!
3- گەر هاتوو یەکێکیش ئەو"شتەی" ناسکرد (گەر شتەکە کەوتەبەر ئاگامەندی مرۆڤێک)، ئەوا ئەو کەسە ناتوانێت ئەو ئاگاییە/ناسینە لەگەڵ کەسانی دیکەدا، بەش بکات!

(لە ڕاستیدا، نازانرێت مەبەستی جۆرجیاس لەم سێ بابەتە چیە. هەندێک وای بۆ دەچن کە تەنها مەبەستی گاڵتەکردن بە فەیلەسوفەکانی پێش خۆی بووبێت!)

ڕاڤە

ئایدیالزم: لە وشەی یۆنانی (ئیدیا/ئایدیا) وەرگیراوە، بە مانای ئەو دیاردەیەی/فێنۆمێنەی کە بە تەنها لە جیهانی هەستدا هەیە.ئەم ئایدیایانە، بەڕای پلاتۆن فۆرمی چەسپاو و نەگۆڕیان هەیە و مرۆڤ تەنها لە ڕێگەی بیرکردنەوە دەتوانێت تێیان بگات

# وانەی 2

## چیرۆک

### سێوەکەی دیاکۆ

بەیانیەک، دیاکۆ بە پەلە، جانتاکەی هەڵگرت و بەرەو دەرگای حەوشە، ڕایکرد.
دایکی هاواری لێکرد:
دیاکۆ، سێوەکەت لە بیر چوو.
دیاکۆ، وەڵامی نەدایەوە، خەریکی کردنەوەی دەرگاکە بوو. دایکی دیسان هاواری کردەوە:
دیاکۆ، دەبێت سێوەکە لەگەڵ خۆت ببەیت.
دیاکۆ، بە نابەدڵی بەرەو ژووری نانخواردن گەڕایەوە، ڕووی لە دایکی کرد و گوتی:
دایە من حەزم لە سێو نیە!
دایکی گوتی:
کوڕە شیرینەکەم، میوە بۆ لەش باشە و پێویستە!
دیاکۆ گوتی:
ئاخر کامیان، باشە یان پێویستە؟
دایکی گوتی:
هەردووکیان.
دیاکۆ گوتی:
دەباشە، من هەنار دەبەم.
دایکی گوتی:
هەنار لە قوتابخانە، ناخورێت!
دیاکۆ گوتی:
بۆ ناخورێت؟ ئەی هەناریش میوە نیە؟ کەواتە ئەویش بۆ لەش باشە.
دایکی گوتی:

ڕاستە، بەڵام، هەنار خواردن کاتی زۆرتری دەوێت، تاکو سێو خواردن.
دیاکۆ گوتی:
کەواتە بە پەلە، دەیخۆم.
دایکی گوتی:
نا، نابێت، بە پەلە خواردن بخۆیت. باش نیە!
دیاکۆ گوتی:
ئەی تۆ نەتگوت، میوە بۆ لەش باشە،
دایکی گوتی:
بەڵێ، وام گوت، بەڵام بە پەلە خواردن باش نیە و کارێکی جوانیش نیە!
دیاکۆ گوتی:
بە پەلە خواردنی میوە، یان بە پەلە خواردنی گشت خۆراکێک؟
دایکی گوتی:
گشت، بە پەلە خواردنێک کارێکی خراپ و ناشرینە.
دیاکۆ گوتی:
کەواتە هەناریش ناخۆم، چونکی گەر هەنار لەگەڵ خۆمدا ببەم، دەبێت بە پەلە بیخۆم. لەبەر ئەوەی کاتی پشووەکەم کەمە.
دایکی دیاکۆ، کە زانی ئیدی گفتوگۆ لەگەڵ دیاکۆدا بێ ئەنجام دەبێت و کاتی زەنگ لێدانی خوێندنگاش نزیک ببووە. بۆیە بە جۆرێک، فەرمانی دا بە دیاکۆ و گوتی:
دیاکۆ، فەرموو، سێوەکە لەگەڵ خۆت ببە و دەشبێت لە کاتی پشوودا، بیخۆیت. تکایە لەوە زیاتریش لەسەر ئەو باسە مەڕۆ. دەشبێت کەمێ پەلە بکەیت، چونکە وا نزیکی سەعات هەشتە.
دیاکۆ، سێوەکەی هەڵگرت و بە ڕاکردن بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆیشت.

وانەی 2

# پرسیار

ئەمە نموونەی چەند پرسیارێکە، با خوێندکارانیش خۆیان پرسیار بکەن

1- ئایا هەر «شتێک» باش بێت، ئیدی پێویستە؟
2- ئایا هەر «شتێک» پێویست بێت ئیدی باشە؟
3- کاتێک کە دوو «شت» وەک یەک باشبن، چۆن بتوانین یەکێکیان هەڵبژێرین؟
4- تۆ لەسەر چ بنەمایەک، «شتەکان» هەڵدەبژێریت. لەبەر ئەوەی باشن، یان، لەبەر ئەوەی پێویستن.
5- ئایا هەڵبژاردنی «شتەکان» پەیوەندی بە کاتەوە هەیە؟
6- ئایا هەڵبژاردنی «شتەکان» پەیوەندی بە شوێنەوە هەیە؟
7- گەر «باشی» سیفەتێکی ناوەکی،-ناوەوەی شتەکان بێت و «جوانی» سیفەتێکی دەرەکی،- دەرەوەی شتەکان بێت، ئەدی «پێویستی» چ سیفەتێکی شتەکانە؟
8- هەندێ جار کەسانی دیکە (دایک و باوک، مامۆستا،....) بڕیار دەدەن چی بکەین و چی نەکەین. وەک لەم چیرۆکەدا، دایکی دیاکۆ بڕیار دەدات، دیاکۆ چی بخوات.
ئایا ئەمە لە بەر ئەوەیە، کە ئێمە خۆمان ناتوانین ئەو بڕیارانە بدەین؟
9-نزیکەی بۆ هەموو شتێک، ڕێسا دانراوە، وەک ڕێساکانی هاتووچۆ، چۆن بڕیار لەسەر خێرایی لێخوڕین دەدات، بۆ نموونە: 60 کم لە سەعاتێکدا. گەر سەرپێچی ئەو یاسایانەش بکەین، سزا دەدرێین، ئایا ئەمە لەبەر ئەم هۆیانەیە؟
- ئێمە خۆمان دەرک بە مەترسی خێرایی لێخوڕین، ناکەین؟
- ئێمە بە تەنگ ژیانی خۆمان و کەسانی دیکەوە نایەین؟
- ئایا ئەو سزایە بۆ ئەوەیە، تا ئێمە زیان بە خۆمان نەگەیێنین؟
10- بڕوا دەکەیت دیاکۆ سێوەکە بخوات. ئەی چ پاڵنەرێک (میکانیزمێک) هەیە وا لە دیاکۆ بکات بە قسەی دایکی بکات؟

تێبینی بۆ مامۆستا
ئەم چیرۆکە پەیوەندی بە یاسای لۆجیکی، ئەریستۆتێلیسەوە هەیە.
دیسان پەیوەندیشی بە بۆچوونەکانی (پێرۆنی ئێلیسی) ەوە هەیە، کە بە «سکێپتیسزم» یان ڕەشبینی ناسراوە.

کلتور

نالی (1800 – 1856)
لە کن تۆ خار و خەست گوڵزارە بێ من
لە لای من خرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ

ئەریستۆتێلیس :
(( پلاتۆن هاوڕێمە، بەڵام ڕاستیم خۆشتر دەوێت.))

دانتێ (1256 - 1321) دەربارەی ئەریستۆتێلیس گوتویە :
(( ئەریستۆتێلیس پێشڕەوی گشت دانایانە.))

مێژوو



ئەریستۆتێلیس (384 تا 322 پ.م.)

یەککێکە لە فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی یۆنان. شاگردی پلاتۆن بووە. دواى مردنی پلاتۆنی مامۆستای، خوێندنگای ئاکادیمیای لە ئاتێن جێهێڵا و لە مەکەدۆنیا بوو بە مامۆستای ئەسکەندەری مەزن کوڕی پاشای مەکەدۆنیا.
ئەریستۆ نزیکەی 170 کتێب- نووسراوی بە ناوەوە هەیە، تەنها 47 یان بە تەواوی ماونەتەوە، ئەم نووسراوانە نزیکەی گشت بوار و دیاردەکانی ژیانیان لە دووتوێدایە، هەر لە باسی زیندەوەرە خشۆکەکانەوە، تا

ـیانی نەمر. ئەریستۆ، ڕەهەندێکی نوێی بە گەلێ چەمک و پرسگەلی فەلسەفی جۆرا و جۆر بەخشیوە. وەک، لۆجیک، میتافیزیک، بوون، ئاکار، بەختەوەری و.... بۆچوونەکانی ئەریستۆتێلیس، شێوازی بیرکردنەوە و ڕوانینی گەلێ لە فەیلەسوفەکانی دوای خۆی گۆڕی. هەروەها ئەو کەسێکی کارا (پراگماتیکەر) بووە. میکانیزم و یاسا سروشتیەکان، زۆر سەرنجی ڕاکێشاوە. بە پێچەوانەی پلاتۆنی مامۆستایەوە، ئەم بڕوای وابوو کە (ئیندیڤید) تاکی شتەکان بوونی هەیە و تەنها ئایدیا، یان بیر، کە ئەم خۆی ناوی نابوون فۆرم، نین، بەڵکو لێرەشن و لە جێگەی دیکە نین. ئەو بڕوای وابوو کە "مرۆڤ هەر بە سروشت ئاژەڵێکی سیاسییە"، یان "ئەوە بێ هێزەکانن کە هەمیشە پەرۆشی یەکسانی و ڕەوایەتین، دەنا بەهێزەکان هەرگیز بیر لەم پرسانە ناکەنەوە"، "گشت مرۆڤێک بە سروشتی خۆی بە پەرۆشە ولە هەوڵی ئەوەدایە کە بزانێت و فێربێت".

دیسان ئەریستۆ بڕوای وابوو کە «مرۆڤی چاک» بە سروشت چاکە و «مرۆڤێ خراپیش» هەر بە سروشت خراپە، کۆیلە بە سروشت کۆیلەیە و خاوەن کۆیلەش هەر بە سروشت خاوەن کۆیلەیە. بەڵام لە دوا ڕۆژەکانی ژیانیدا، کۆیلەکانی خۆی سەرفراز و- ئازاد کرد.

.ئەریستۆتێلیس پێی وابوو، شیعر لە مێژوو فەلسەفیانەترە و دەهێنێت گرنگی زیاتر پێ بدرێت. بە بڕوای ئەریستۆتێلیس، سۆکراتیس بە هەڵەدا چووە کە گتویەتی:((فەزیلەت و پاکێتی، یان ڕەوشت بەرزی، حیکمەتە.)) بۆیە خۆی گوتویە:(( بۆ ئەوەی ببیە مرۆڤێکی ئاسایی و ڕەوشت بەرز، تەنها زانینی ڕاستی بەس نیە، بەڵکو هەڵبژاردنییشی گرنگە)).

ئەریستۆتێلیس، بڕوای وابوو، کە گیان، بنەمای هەبوونی گشت تەنێکی زیندووە، بەم بۆچونەش دەگوترێت «دوالیزم».

گرنگترین ئەفراندنی فەلسەفیانەی ئەریستۆ لۆجیکەکەیەتی، گەر بە شێوەیەکی ئاسان ڕوون بکرێتەوە، بەم شێوەیە دەبێت:

پرێمیسەی یەکەم: هەموو میوەیەک بۆ لەش باشە

پرێمیسەی دووەم : هەناریش میوەیە

ئاکام : کەوابوو، هەناریش بۆ لەش باشە

ئەریستۆتێلیس، بڕوای وابوو کە لۆجیک، چونکێ خۆی لە خۆیدا هیچ زانیارییەکمان ناداتێ، بۆیە خۆی بە بابەتێکی دیاریکراو، یان واقیعەوە خەریک ناکات، بەڵکو هۆکارێکە، زانست بۆ ڕاڤەکردن و سەلماندنی خۆی بەکاری دێنێت. ئەو دەیگوت: (( گەر هەبوونی شتەکان جەبریبن (واتە بەزەرورەت دروست بووبن) ئەوا دەبێت ئێمە بیر لە بزوێنەر/ پاڵنەری یەکەم بکەینەوە.)) بە واتایەکی دیکە، دەبێت بزووینەرێك، هێزێکی پاڵنەر لە سەرەتاوە هەبووبێت کە گشت «شتەکانی» خستبێتە بزاوت. بەڵام نابێت ئەم بۆ چوونە وا لێکبدرێتەوە کە یەکەم دروستکەر و خولقێنەر هەر ئەو هێزە بووە، بەڵکو ئەو تەنها جووڵەی بە پرۆسێسەکە داوە. بە بڕوای ئەریستۆتێلیس، مرۆڤ ئاژەڵێکە، بەڵام ئاژەڵێکی ئاگامەند. ئەمیش وەک پلاتۆن، فەلسەفەی بەسەر سێ بابەتدا دابەش کردووە:

بابەتی یەکەم، میتافیزیک (خوداناسی) ئەمەیانی بە فەلسەفەی یەکەم داناوە و بەرزترین پلەکانی فەلسەفەیە لە لای. ماتماتیک و سروشتناسییش هەر دەچنە ئەم بەشەوە.

بابەتی دووەم، زانستی پراکتیکی : ئاکار، ڕامیاری و ئابوری

بابەتی سێیەم، هونەر: شیعر، شانۆگەری، نیگارکێشان، ڕەوانبێژی.

ئەریستۆتێلیس، بابەتێکی دیکەی گرنگی وروژاندوە، ئەویش ئاکار (ئێتیک)ە. بە بڕوای ئەو، ئامانجی ئاکار، ئەوەیە کە مرۆڤ، چ وەک تاک و چ وەک کۆمەڵ، ئاسودە بکات.

بە بڕوای ئەریستۆتێلیس، بیرکردنەوە سێ مەبەست، یان چاکەی هەیە :

- ئاگامەندی، ئامانجەکەی گەیشتنە بە ڕاستی (حەقیقەت).
- زانین، ئامانجەکەی پەیداکرن و بەرهەمهێنانە.
- ژیرێتی، ئامانجەکەی ڕەفتارکردن و دانوستاندنە.

بۆ هەبوونی هەر بابەت/ شتێکیش چوار هۆکاری دەستنیشان کردووە.

- هۆکاری ماتەری (ئەو شتە لە چی دروستکراوە)
- هۆکاری ئەفراندن وخوڵقاندن (ئەو شتە چی، یان کێ دەی ئەفرێنێ و دەیخوڵقێنێ)
- هۆکاری خەسڵەتی (ئەو شتە چ خەسڵەتێکی تایبەتی هەیە، بۆچی دروستکراوە)

هۆکاری هۆیی (ئەوشتە بە چ هۆیەک دروستکراوە،خوڵقێنراوە)
بە بڕوای ئەریستۆتێلیس، هەرچی "شت" هەیە لە سروشتدا، بۆ مەبەستێک دروست بووە. سروشت هەر لە کردەوەی دانوستاندنی مرۆڤ دەچێت، مەگەر دانوستاندن مەبەستێکی تایبەتی نیە؟
هەر بەو شێوەیەش سروشت مەبەستی خۆی هەیە. بۆ نموونە: گەر کورسی یەکێ بووایە لەو شتانەی کە لە سروشتدا پەیدا دەبن، ئیدی هەر لەو کورسیە دەچوو کە ئێستا مرۆڤ دروستی دەکات.
ساڵی (335 پ.م.) ئەریستۆتێلیس گەڕایەوە بۆ ئاتێن و خوێندنگایەکی فەلسەفی تایبەت بە خۆی دامەزراند بە ناوی «لیکەیۆن»، زۆرترین کتێبی ئەو ڕۆژگارە، لەم خوێندنگایەدا کۆکرابۆوە و گەورەترین کتێبخانەی ئەوروپا بووە. ساڵی (323 پ.م.) ئەلەکساندەری مەزن مرد، خەڵکی ئاتێن دژی مەکدۆنیەکان ڕاپەڕین، ئەریستۆتێلیسیش، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی مامۆستای ئەلەکساندەر بوو، بە ناچاری بۆ دواجار شاری جێهێڵا و ساڵی دواتر مرد.

## پێرڕۆنی ئێلیسی (360 تا 270 پ.م.)

پوختەی بۆچونەکانی ئەم فەیلەسوفە ئەوەیە، کە دەرک بە دوو جیاوازی لە هەر شتێکدا بابەتێکدا بکەین.
یەکەم: ئەو شتە/بابەتە، چۆنە بۆ خۆی (لەناو خۆیدا)
دووەم: ئەو شتە/بابەتە، چۆنە بۆ من کاتێک کە دەکەوێتە بەر هەستەکانم (ئاگامەندیم) بە واتایەکی دیکە، ئێمە ناتوانین هیچ زانیارییەک دەربارەی شتەکان/بابەتەکان، لە سروشتی خۆیاندا بە دەست بهێنین، تا نەکەونە بەر هەستەکانمان (ئاگامەندیمان).
با دیاکۆ و دایکی بکەین بە نموونە، دیاکۆ حەزی لە سێو نیە، دایکیشی بڕوای وایە کە سێو بۆ لەش باشە. لەم حاڵەتەدا ئەم دوو کەسە ناکۆکن و هەردووکیشیان ڕاستن. بە واتایەکی دیکە، بابەتی سێو بۆخۆی (لەناو خۆیدا) بەکەڵکە، ئالێرەدا دایکی دیاکۆ ڕاستە، بەڵام کاتێک دیاکۆ حەزی لە سێو نیە، ئیدی ئەو کاتە سێو ئەو بابەتە نیە کە لەناوخۆیدا باشە، بەڵکو بۆتە بابەتێک و کەوتۆتە بەر هەستەکانی دیاکۆ،ئیدی لێرەدا

دیاکۆ ڕاستە. بەکورتی، ڕەنگ و بۆن و تام و چێژ، شتگەلێکن ناکرێت گفتوگۆیان لەسەر بکەین.
پێڕۆن، لەم ڕوانگەیەوە بڕوای وابوو کە فەیلەسوفەکان نابێت هێندە، بنبڕ/ئەبسلوتی قسەبکەن. ئەم بۆچوونەی نەک هەر کردیە هاوڕای سۆفیستەکان بەڵکو لەوانیشی تێپەڕان.
دیارە ئەم بۆچوونەش تەواو دژ بە لۆژیکەکەی ئەریستۆتێلیسە.

ڕاڤە :

ئەبسلوت: لە وشەی «ئەبسۆلۆتۆس» وەرگیراوە و مانای بێ بەربەست، تەواو/بێ لەمپەڕ، دەدات، بە پێچەوانەی ڕێلێتیڤ، کە مانای ڕێژەیی، سنوردار، تا ڕادەیەک، ناتەواو، دەدات

لۆجیک: لە وشەی یۆنانی «لۆگۆس» وەرگیراوە، بەپێی پریمیسەکان، یان گوزارەکان، کۆنکلوشن، یان ئاکام دەسەلمێنن.پریمیسە،ڕستەکانی سەروو هێڵی هاوکێشەکەن.
پرێمیسەی یەکەم
پرێمیسەی دووەم
ئاکام

ڕوونکردنەوە:
دەتوانین بڵێین حەز و سۆزیش، وەک ڕەنگ و تام و چێژ دەکەونە ژێر هەمان ڕێساوە، بۆیە ئەو بەیتە شیعرەی نالی، زۆر لەم بۆچوونەوە نزیکە.

وانەی 3

چیرۆک

دوکانداری

هێمن لە پشت پەنجەرە پچووکەکەی فرۆشگای خوێندنگاوە وەستابوو. زۆر بە گورجی، بەڵام بێ شپرزەیی، کێک و بسکیت و کۆلا و شەربەتی بە خوێندکاران دەفرۆشت.
کڕیارەکان بە پەلە بوون، دەیانوویست کەمترین کاتی پشووەکەیان بۆ شتکڕین بەکاربهێنن.
خوێندکارێک داوای قوتوویەک شەربەتی پرتەقاڵی کرد، هێمنیش بە گورجی قوتوویەک شەربەتی ساردی دایەدەستی. خوێندکارەکە بڕێک پارەی دا بە هێمن و بێ ئەوەی لە قوتووەکە بڕوانێت یەکسەر هەڵیپچڕی و قومێکی لێدا و دوای کەمێک ڕووی کردە هێمن و گوتی:
- ئەم شەربەتە زۆر ناخۆشە، خۆ بەسەرنەچووە؟
هێمن گوتی:
نەخێر هێشتا چەند مانگێکی ماوە بۆ بەسەرچوون.
کاتێک هێمن بە ووردی سەرنجی قوتووەکەی دەستی خوێندکارەکەی دا، دیتی ئەو قوتووە شەربەتی نارنجە، نەک پرتەقاڵ، بۆیە بە خوێندکارەکەی گوت:
ببوورە من شەربەتی نارنجم داویتەتێ، هەرچەندە هەڵیشتپچڕیوە، بەڵام دەتوانم ئەو قوتووە وەربگرمەوە و قوتوویەک شەربەتی پرتەقاڵت بدەمێ.
کاتێ کڕیارەکەش سەرنجی قوتووەکەی دا، دیتی ئەوە شەربەتی نارنجە؛ ئیدی بەتوڕەییەوە ڕوویکردە هێمن و گوتی:
دیارە تۆ بیر لە حەز و زەوقی کڕیارەکانت ناکەیتەوە، کەواتە تۆ دوکاندار نیت؛ یان ڕاستتر بڵێم، تۆ بۆ دوکانداری ناشێیت!
هێمن کەمێ نیگەران بوو، بەڵام لەسەرخۆ وەڵامیدایەوە:

بەگوێرەی گوتەکەی تۆ، هەر کەسێ بیر لە زەوقی کەسانی دیکە بکاتەوە دەتوانێت ببێت بە دوکاندار، منیش بیر لە زەوق و حەزی کڕیارەکانم دەکەمەوە، کەواتە منیش دوکاندارم. ئەوەی ڕوویدا هەڵەیەک بوو، نە من و نە تۆش زوو هەستمان پێنەکرد.
کڕیارەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی:
هەڵە؟ ئەوە کاری تۆیە وەک فرۆشیار کەرەستەی داواکراو بدەیتە کڕیارەکان.
هێمن گوتی:
بەڵێ ڕاستە، بەڵام کڕیاریش دەبێت بزانیت کە ئاخۆ کەرەستەی دڵخوازی خۆی دراوەتێ، یان نا.
خوێندکارە کڕیارەکە بە دڵنیایەکی لەخۆ بایبوونەوە، گوتی:
من پێموایە ئەوە تەنها ئەرکی فرۆشیارە، بۆیە بەڕای من، تۆ دوکاندار نیت.
هێمن لە ناخی خۆیدا زیاتر نیگەران بوو، بە نیازبوو بە کڕیارەکە بڵێت، کە بە هەڵەدا چووە، چونکە (( من هەم بیر لە زەوقی کڕیارەکان دەکەمەوە و هەم دوکانداریشم))، بەڵام ئەو ڕستەیەی نەدرکاند و کەمێ لە کڕیارەکە ڕاما و دواتر گوتی:
گەر دەتەوێت قوتوویەک شەربەتی پرتەقاڵت دەدەمێ، یان پارەکەت دەدەمەوە؛ فەرموو بڕیاربدە.
خوێندکارە کڕیارەکە، بەگومانەوە سەرنجێکی هێمنی داو گوتی:
قوتوویەک شەربەتی پرتەقاڵم بدەرێ.

تێبینی بۆ مامۆستا
بیرۆکەی ئەم چیرۆکە لە کۆجیتەکەی دێسکارت وەرگیراوە.
((*کۆگیتۆ ئێرگۆ سوم.*))
((*من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم.* ))

وانەی 3

پرسیار

1- ئایا دەکرێت لە هەموو کات و ساتێکدا وردبین و بەدیقەت بین؟
2- ئایا هەڵە بەشێکی سروشتییە لە ژیان و هەڵسوکەوتی مرۆڤ؟
3- ئایا ئاساییە لەدوای گشت هەڵەیەک داوای لێبووردن بکەین، گەرچی ئەو هەڵەیە بەمەبەستیش نەبوبێت؟
4- ئاشکرایە تا مرۆڤ کار و کردەوە، نەکات هەڵەش ناکات. گەر هاتوو لە کارێکدا یان کردەوەیەکدا، هەڵەمان کرد، ئەمە مانای ئەوەیە کە دەبێت ئیدی واز لەو کارە بهێنین، چونکە ئێمە بۆ ئەوکارە ناشێین؟
5- ئەوە هەر ئەرکی فرۆشیارە کە گشت " مافێکی" کڕیار بدات، یان ئەرکی کڕیاریشە کە داوای کە گشت "مافێکی" خۆی بکات بەرانبەر ئەو نرخ، یان هەقدەستەی کەدەیدات؟
6- ئایا مرۆڤ دەبێت بیربکاتەوە تا هەبێت، یان دەبێت هەبێت بۆ ئەوەی بیربکاتەوە؟
7- ئایا خەسڵەتی بیرکردنەوە و دنیا بینی، بەپێی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا دێت؟
8- ئایا لە جیهان و لە ژیاندا " شتێک " هەیە مرۆڤ گومانی لێ نەکات؟
9- گەر هەر کێشە و پرسیارێک بۆ چەند بەشێک شیبکەینەوە، ئیدی چارە و وەڵامدانەوەی ئەو کێشە و پرسانە ئاسانتر دەبێت؟
10- ئایا لەرێگەی ماتماتیکەوە بەڕاستی و بێگومانی دەگەین؟

مێژوو

## ڕێنێ دێسکارت( 1596 -1650)



ڕێنێ دێسکارت، (ڕابەری فەلسەفەی نوێ و پێشڕەوی ڕێبازی ڕاشاونالیزم، ئاوەزی/ عەقڵانی) دادەنرێت. لە شارۆچکەی فلێچێ، لە فەرەنسا، لە دایکبووە و خوێندنی تەواوکردووە، ساڵی 1618 خۆی بۆ خزمەتی

سەربازی ناونووس دەکات و دەچێتە هۆڵاند و دواتر بۆ درێژەدان بە خوێندن، دەچێتە ئاڵمانیا. دێسکارت، هێندە پەرۆش و لەخەمی بیرکردنەوە و بۆچوونەکانی خۆیدا بووە، پێیوابووە، کە خودا ئەوی بۆ «پەرەپێدانی زانستی نوێ و بێهاوتا دەستنیشانکردووە!» بەڵام بە بڕوای خۆی ئەو هێشتا بۆ ئەو کارە نەدەشیا، هەر بۆیە زیاتر خۆی بە لێکۆڵینەوە لە مێتافیزیک و بایۆلۆجیەوە خەریک کرد. لە ساڵی 1637دا یەکەم کتێبی خۆی بەناوی «دێسکۆرسی مێتۆد/ گوتار دەربارەی مێتۆد»ی بڵاوکردوە. لە ساڵی 1641دا کتێبی «مێدێتەیشن/ بەناخدا ڕۆچوون دەربارەی بنەماکانی فەلسەفە»ی بڵاوکردەوە. ئەم دوو کتێبە لە شێوەی بیۆگرافیدا نووسراون و کارێکتەری سەرەکی «من»ێکی تاڕادەیەک سەرلێشێواوە و بە دوای وەڵامی چەند پرسێکدا، یان زانیاریدا وێڵە. بەکورتی، دێسکارت، پەیوەندیەکانی نێوان «خۆ» و «دەرەوەی خۆ»ی بە زانینەوە بەستۆتەوە و لەسەر زەمینەیەکی ئەپستمۆلۆجی (زانیاری) دایمەزراندووە.

دەتوانین کۆجیتەی «من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم» بکەین بە دوو بەشەوە، یان دوو «من»ەوە. منی یەکەم، سەربەخۆیە و وابەست نیە بە بوونێکی ماتەرییەوە. کەواتە بیرکردنەوە لای ئەم منە، ناوەڕۆکێکی گیانەکییە و پەیوەستی جیهانێکی بەرزە. منی دووەم، بوونێکی ماتەرییە و لە بوونی ناوەڕۆکە گیانەکیەکە ترازاوە و پەیوەستە بەم جیهانەوە/ ئێرە، ئەمەش کۆنتراس و دژوارییە، لە دوالیزمی دێسکارتدا.

بەگوێرە ئەم بۆچوونەی دێسکارت، گیان/ بیرکردنەوە، دەتوانێت بەبێ هەبوونی لەشیش هەبێت، یان ڕوبدات. گەر مرۆڤ ناوەڕۆکێکی گیانەکی هەبێت، ئەوا دەبێت بڕوا بەوە بهێنین، کە کەسانی دیکەش وەک ئێمە ئاگامەندن و بیریش دەکەنەوە. بەڵام ئەم بڕوا هێنانە بەڵگەی لۆژیکمەندانەی بوونی کەسانی دیکەمان ناداتێ، چونکە بەپێی ئەم شیکردنەوەیە، ئەمە تەنها بەراوردکردن و وێکچواندنە، «ئانالۆجی»یە. باوەڕهێنان بە بوونی هێزێکی لە پێشتری ئۆنتۆلۆجی، ئایدیالیستیانە (ئاوەزی- عەقڵی) بۆتە چاوگی بوونی مرۆڤ و زانینی دروست و بەها ڕەوشتیەکان. گەر (سەدەمی ئاوەزی) نەبێت، ئەوا نە مرۆڤ و نە زانین و نە بەهای ڕەوشتیش، نابن.

دێسکارت، وەک پلاتۆن و ئەریستۆ، تایبەتمەندێتی مرۆڤ بۆ خەسڵەتێکی نەگۆڕ و چەسپاو دەگەڕێنێتەوە، بێگومان ئەم بنەڕەتە ئۆنتۆلۆجیە ئاوەزییە، دەستەڵاتی داهێنان لە مرۆڤ دەستێنێتەوە و هێندەشی ئازادی پێ ڕەوا دەبینێت، کە تەنها کردەوە چاکەکان هەڵبژێرێت.
پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکانی نێو فەلسەفەکەی دێسکارت، هەوڵێکە بۆ گەیشتن بە زانیارییەکی ڕاست و بەدەر لە گومان. لە کتێبی دووەمیدا، کۆمەڵێک پرسیاری قوتکردۆتەوە، وەک « من دەتوانم گومان لەچی بکەم؟»، یان « ئایا شتێک هەیە من گومانی لێنەکەم؟» لەم پرسیارانەدا بەدیار دەکەوێت، کە دێسکارت لە گێژەنی گومانێکی سەختدا سوڕی خواردووە، ئەم گومانە لە خاڵێکدا دەگاتە لوتکە، کە تەنانەت هاوکێشە ماتماتیکیە بەڵگەنەویستەکانیش دەگرێتەوە، کاتێک دەڵێت ((تەنانەت، گومانیشم لە ماتماتیک هەیە. دەشی گیانێکی شەڕانی ، هێزێکی خراپە، وام لێبکات بڕوا بەوە بهێنم، کە 2+2 =4، بەڵام ڕەنگە لە ڕاستیدا بکاتە 5 یان 6)) یان دەڵێت: (( من تەناتەت لە وەش بەگومانم، کە ئەم لەشە، جەستەی من بێت، چونکە کاتێک خەون دەبینم، دەشێ واهەستبەکەم لەبەر ئاگردانێکدا دانیشتووم و لە نێڵەی ئاگرەکەی دەڕوانم. تەواوی دیمەنەکە زۆر زیندوو دێتە بەرچاو، وام لێدەکات بڕوابکەم کە بەئاگام. باشە ناکرێ نوقرچێک لەخۆم بگرم؟، ئەرێ دەکرێ، بەڵام دیسان هەر لەخەوندا ئەو نوقرچە لەخۆم دەگرم. ئیدی چۆن بتوانم خەون و ڕاستەقینە لێك جودا بکەمەوە؟ یانژی چۆن بزانین کە ئەوە گیانێکی شەڕانی نیە هەردەم فێڵمان لێدەکات و بە هەڵەماندا دەبات؟)).
دێسکارت بڕوای وابوو، کە هەستەکانمان هەردەم بەهەڵەماندا دەبەن. تەنانەت ڕەوشت و ئاکار و زانستیش، جێگەی گومانن. تاقە شتێک کە دێسکارت لێی بەگومان نیە، بوونی خودایە. بۆ سەلماندنی هەبوونی خودا، دێسکارت بە چوار هەنگاو/ قۆناغ ، ڕاستەقینەی ئەو بوونە دەسەلمێنێت :

1- من کاتێک لە گوماندابم، ئیدی هەست بە ناکاملّی/ ناتەواوی خۆمدەکەم.

2- من (ئایدیا ) بیرێکم دەربارەی کاملێک/ تەواوێک، هەیە.

3- منێکی ناکامڵ/ ناتەواو، بنەما و هۆکاری ئەم (ئایدیا ) بیرە نیم.

- (ئایدیا)، بیرەکە هۆکاریکی هەیە، ئەویش خودایە.
ڕەنگە بزوێنەری دەستنیشانکردنی ئەم چوار خاڵە/ هەنگاوە، هۆکارەکەی ئەوەبێت، کە دێسکارت بڕوای وابوو، ئیدیا/ بیر زگماک و خۆڕسکە.
لەگەڵ ئەمانەشدا دێسکارت بە ڕابەری فەلسەفەی نوێ و ڕێبازی مۆدێرنەتە، دادەنرێت، چونکە بڕوای وابوو کە ئەو بنەڕەتە زانیارییەی بنەمای زانستە نوێیەکانی لەسەر دارێژراوە، دەکرێ لەڕێگای فەلسەفەوە داکۆکییان لێ بکرێت، بۆیە چوار ڕێسای داناوە، کە بە مێتۆدە گەردونیەکان، ڕێسا گشتگرەکان، یان (یونڤێرشاڵ مێتۆد) ناوی بردوون. بڕوای وابووە، کە دەکرێ بۆ ڕاڤەی زانست و فەلسەفەش بەکار بهێنرێن:
ڕێسای 1
تەنها ئەو ڕاستیانە قبوڵ بکە و وەربگرە، کە ڕوون و ئاشکران و ناشێ گومانیان لێبکرێت.
ڕێسای 2
هەردەم کێشە ئاڵۆزەکان، ورد بکەرەوە (بەش بەش) بکە، تا گشت ووردەکاریەکانی بە باشی ببینیت.
ڕێسای 3
بە قۆناغ بیربکەرەوە، هەمیشە لە کێشە و پرسیارە ئاسانەکانەوە دەسپێبکە و هەنگاو بە هەنگاو بڕۆ بۆ کێشە و پرسیارە سەختەکان.
ڕێسای 4
بە دیقەت بە و مەهێڵە دەرئەنجام و شیکردنەوەکانت بە هەدەر بڕوات و لە دەست بچێ.
ئەم ڕێسایانە، ژیری، ئاوەز و ماتماتیک، دەکات بە بنەما. یەکێک لەو کەسانەی کە زۆر کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەی دێسکارت هەبووە، ئێوکلیدی یۆنانی بووە.
ئێوکلید، زانای ماتماتیک، لە ساڵانی (300 پ.م.) لە ئەلەکسەندەریە ژیاوە. ئەم زانایە کۆمەڵێ زانیاری و زانستی لە کتێبێکدا کۆکردۆتەوە و نێوی ناوە (ئێلێمنتا) کە تێکەڵەیەک بووە لە زانستی گیۆمێتری/ ئەندازە و لۆجیک. ئەم کتێبە تا ساڵەکانی سەدەی هەژدە لە زانکۆکانی ئەورووپادا دەخوێندرا. ئێکۆلید، لەو کتێبەدا کۆمەڵێک پێناسەی

ڕشتووە، ناوی ناون «ئاکسیۆم» ئەم ئاکسیۆمانە، هەوڵێک نین بۆ سەلماندنی ڕاستیەکان و وەک پێویستی دانەڕێژراون، بەڵکو هەرکەسێک بیان بینێت، یەکسەر تیدەگات و دەزانێت کە ڕاستین.
(( ئاکسیۆمەکان خۆیان ڕاستییەکی درەوشاوەن.))

## ئێمانۆیل کانت (1724 -1804)



بە ڕابەری فەلسەفەی نویی ئاڵمانی دادەنرێت. سەردەمی زێڕینی فەلسەفەی ئاڵمانی لەگەڵ کانتدا دەست پێدەکات و هەریەک لە شۆبنهاوەر، هێگڵ، مارکس، فیۆرباخ، فێختە، ئانجلس، نێتشە، هۆسرڵ و هایدگەر، زیاتری دەڕازێننەوە. کانت، ڕۆڵی لە هەموویان زیاتر دیارە.
کانت ((ئەو مەزنە گچکەیە، یان، ئەو گچکە مەزنە)) گرنگی ڕۆڵەکەشی لەوەدابوو کە ڕێبازی «ڕاشونالیزمی» لەگەڵ ڕێبازی «ئێمپێریزم» دا تێکەڵ کرد.

## ڕاڤە

### ئێمپێریزم :

ئەزمونی، لە وشەی (ئێمپایریا)ی یۆنانی وەرگیراوە. ئەم ڕێبازە لە بریتانیا، لە هەمبەر ڕێبازی ڕاشونالیزمدا سەری هەڵدا. بەگوێرەی ئەم ڕێبازە، زانیاری لە ڕێگەی ئەزمونەوە وەردەگیرێت و سەرچاوەکەشی تەنها هەستەکانن. (دروست بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی دێسکارتەوە)

### دوالیزم:

لە وشەی«دوالیس» ی لاتین وەرگیراوە. هەر شتێک کە لە دوو شت پێکهاتبێت. بڕوابوون بە دوو بنەما لە تیۆری میتافیزیکدا کە بنەمای بوون، بۆ دوو هۆ دەگەڕێنێتەوە.

## ڕاشونالیزم:

ئاوەزیی، لە وشەی (ڕاتیۆ/ ڕاشیۆ) ی لاتین وەرگیراوە، بەگوێرەی ئەم ڕێبازە بە دەستخستنی زانیاری دەربارەی ڕاستەقینە (حەقیقەت) و بابەت، تەنها لە ڕێگەی ئاوەزەوە دەبێت. ئەم ڕێبازی ڕاشاونالیزمیە، لە دوای دێسکارتەوە، هەریەک لەم فەیلەسوفانە پەیڕەویان کرد باروچ سپێنۆزا (1632- 1677)، گۆتیفرید ویلهێلم لێیبنیز (1646- 1716) و ئیمانۆیل کانت.

## مێتافیزیک:

لە هەردوو وشەی «مێتا» و «فیزیک» یۆنانیەوە وەرگیراوە، بە مانای «دوای سروشت» ئەودیو سروشت.

ئەم چەمکە، لە کتێبەکانی ئەریستۆتێلیسدا، دوای مردنی خۆی، نووسراوە. ئەریستۆتێلیس خۆی لەبری ئەمە، چەمک یان وشەی « پریما فیلۆسۆفیا/ فەلسەفەی یەکەم»ی بەکارهێناوە.

وانەی 4



بودداه (بودا)

شازادە سیداهارتا گەوتاما، نزیکەی (500 ساڵ پ.م) لە باکووری هندوستان ژیاوە. سیداهارتا، وەک شازادەیەک لە هیچی کەمنەبووە. هەر لە خۆراک و پۆشاک، تا موڵک و سامان و خۆشگوزەرانی ژیان. هەر کاتێک هەستی بە دڵتەنگی بکردبایە، دەیان لێبوک و قەرەقۆز، قۆشمەییان بۆی دەکرد تا دەیانهێنایە خەندە. گەر ساتێک پەژارە بووایە، سەدان شۆخی نازدار، بۆ خەمڕەوێنی ئەو. سەمایان دەکرد و بە دەنگی بەسۆز سترانیان دەچڕی.
بە فەرمانی شا (بابی سیداهارتا) هەرچ شتێک نیشانە، یان مایەی نیگەرانی و پەژارەیی بوایە، لە کۆشک و دەرەوەی کۆشکدا، نەدەبووایە بکەوێتە بەر دیدی شازادە. (ئاخر کە سیداهارتا لە دایک بوو، بابی، گشت جادوگەرانی مەملەکەتی بانگ کرد، تا فاڵ بگرنەوە و بزانن چارەنووسی شازادە بە چی دەگات. دوای فاڵگرتنەوە و لە ئەستێران ڕوانین و مشتومڕێکی زۆر، گەورە جادوگەری وڵات چووە خزمەت شا و پێیگوت:
-گەورەم، ئەم کوڕەی جەنابتان منداڵێکی ئاسیی نیە. بەڵام گەر شازادە، هەردەم لەتەک بابی لە کۆشکدا بمێنێتەوە، ئەوا لە پێشین ڕۆژدا گشت مەملەکەتەکانی هیندوستان داگیردەکات و دەبێتە شای شاهان و گشت جیهان. وەلێ گەر لە کۆشک چوویە دەرەوە و دنیای دیت، ئەو کات دەبێت بە ڕزگارکەر و ڕێنیشاندەری گشت مرۆڤان.) شا، کە دەیویست کوڕە تاقانەکەی نەک هەر جێگەی بگرێتەوە، بەڵکو بشبێتە شای گشت شاکان، بەشی دووەمی وەڵامەکەی بە دڵ نەبوو، هەر بۆیە فەرمانی دا هەرچی جادوگەر لە وڵاتدا هەیە، لەناو ببرێن. تا ئەو نهێنیە نەدرکێنن. شا، هەردەم بە سیداهارتای دەگوت، کە دنیا گشتی

وەک ئەم کۆشکە، پڕە لە خۆشی و ئاسودەیی. بەڵام سیدەهارتا حەزی دەکرد خۆی ئەوە بە چاو ببینێت. بۆیە بڕیاری دا لەکۆشک بچێتە دەرەوە. شا کەزانی کوڕەکەی سورە لەسەر چوونە دەرەوە، بە پەلە قەرەوڵ و پاسەوانی ناردە ناو شار تا هەرچی پیر و پەککەوتە و نەخۆش و هەژار و بێ دەرەتان هەیە، لە شەقام و کۆڵانەکانی شاری دوور بخەنەوە. هەروەها فەرمانی دا کە خەڵکی دەبێت لە سەما و شادی زیاتر، خەریکی چیدیکە نەبن.
کە سیداهارتا گەیشتە ناو شار، دیتی شار وەک ئەوە وایە کە بابی بۆی باسکردبوو. خەڵکی شادن و هەژار و نەخۆش و بێدەرەتانیان تێدا نیە. لە کاتی گەڕانەوەدا لەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا چاوی بە پیاوێکی پیر کەوت، کە لەبەر پیری خۆی بۆ نەدەگیرا و خۆی دابوو بەسەر گۆپاڵەکەیدا. دیاربوو پاسەوانەکان بیریان چووبوو ئەو پیرە دوور بخەنەوە، ئیدی سیداهارتا کەوتە ڕامان و بیرکردنەوە.
ڕۆژێکی دیکە، دیسان سیداهارتا لە کۆشک چووە دەرەوە و بابیشی هەمان فەرمانی بە پاسەوانەکان و خەڵکی شاریش دایەوە. خەڵکی خەریکی سەما و شادی بن.
ئەم جارەش لە کاتی گەڕانەوەدا، سیداهارتا چاوی بە پیاوێکی لاواز و زەردهەڵگەڕاو و نەخۆش کەوت. دیسان بووە مایەی ڕامان و بیرکردنەوەی.
جاری سێیەم بە هەمان ڕێوڕەسم چووە دەرەوە، ئەم جارە دیتی لە کۆڵانێکدا ئاگر کراوەتەوە و دوکەڵ هەڵدەستێت. دیتی وا چەن کەسێک خەریکن لاشەی مردوویەک دەسوتێنن (هیندۆسەکان لاشەی مردوو دەسوتێنن). جاری چوارەم کە لە کۆشک چووە دەرەوە، موغێکی دەرۆزەکەری دیت. کەوایەکی جاوی لەبەردا بوو، سەری پاک تاشیبوو، کاسەیەکی چێشتی بەدەستەوە بوو. سیداهارتا لە دیمەنی ئەم موغەوە فێر بوو کە مرۆڤ چۆن بە دوای مانای ژیاندا عەوداڵ دەبێت.
ئیدی سیداهارتا بڕیاری دا بە شوێن پەیداکردنی مانای ڕاستەقینەی ژیاندا بگەڕێت و ژیانی ڕتوشکراوی نێو کۆشک و تەلار تورهەڵدا و عەودالی ڕاستی بێت. لە نیوەشەوێکی هێمندا بە نیگایەکی پڕ لە هەست و خۆشەویستییەوە بۆ دواجار لە ڕوخساری هاوسەرەکەی و کوڕە

قانەکەی ڕوانی، کە لە شیرین خەودا بوون و بێدەنگ ماڵئاوایی لێکردن. هەر ئەو شەوەش تەخت و تاجی شاهانەی تورهەڵدا و ڕوی لە کەژ و هەرد و جەنگەڵ کرد، تا ڕاستی پەیدا بکات. سەری خۆی پاک تاشی. شەش ساڵان لە خزمەت پیرانی تەریقەتدا مایەوە تا تەواو بەناخی خۆیدا ڕۆچوو. دوای خەتمکردنی تەریقەت و تێگەیشتن لە چوار ڕاستی.

ڕاستی یەکەم : هەموو بوونێک، ناتەواو ئازاراوییە و پڕە لە ئازار.

ڕاستی دووەم : هەموو بوونێک وابەستەی حەز و چێژە و عەودالّی بە دەسخستنی شتی چەسپاو و تەواوە، لە جیهانێکی ناچەسپاو و ناتەواودا.

ڕاستی سێیەم : گەیشتن بە نیرڤانا (پاکێتی)

ڕاستی چوارەم : پەیداکردنی ڕێگاکانی گەیشتن بە نیرڤانا، (هەشت ڕێگان و بە ڕێگا ڕاستەکان ناسراوون):

1- دیدی ڕاست.
2- بیرکردنەوەی ڕاست.
3- گوتاری ڕاست.
4- هەڵس و کەوتی ڕاست.
5- بژێوی ڕاست.
6- تەوانایی (تەحەمول) ڕاست.
7- ووریایی، یان هۆشیاری ڕاست.
8- ڕامانی ڕاست (مێدیتەیشن).

دوای گەیشتن بەو ڕاستیانە، سیداهارتا، چووە ژێر درەختێک (دواتر ئەو درەختە ناونرا درەختی بودا) و بە هەموو ناخی خۆیدا ڕۆچوو (مێدیتەیشنی کرد) ئیدی هەستی کرد، کە سیداهارتا لە ناخی ئەودا وون بوو. (بودا = هۆشیار) جێگەی گرتەوە. بودا لە سەرتاپای هیندوستاندا ناوبانگی بڵاوبۆوە. خەڵکی دەهاتنە زیارەتی. نەیان دەپرسی: «تۆ کێیت؟» بەڵکو دەیانپرسی: «تۆ چیت ؟».

دەیانپرسی : تۆ خودایت؟

دەیگوت : نەء.

دەیانپرسی : تۆ فریشتەی؟

دەیگوت : نەء.

دەیانپرسی : تۆ پیر و پیاوچاکی؟
دەیگوت : نەء.
دەیانپرسی : ئەی تۆ چیت؟
دەیگوت : من بودام، (من هۆشیارم).

## زانیاری زیاتر

گەرچی بەسەرهاتی ژیانی بودا تێکەڵەیەکە لە ڕاستی و ئەفسانە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوە مێژووییە هیندوییەکان دەڵێن سیداهارتا، کوڕی پادشای وڵاتی نیپاڵ، کە بەشێک بووە لە هیندوستان، لە ساڵی (563 تا 483 پ.م.) ژیاوە و لە تەمەنی 29 ساڵیدا ژن و منداڵ و تەخت و تاج جێ دەهێڵێت و دوای موغێکی هیندو دەکەوێت، تا فێری مێدیتەیشن (ڕامان) ببێت. لە داوای 6 ساڵ لە ڕۆژوو گرتن و ڕامان و بیرکردنەوە. دەگاتە (ڕاستی) ڕاستییەک کە تا کۆتایی ژیانی لەگەڵیدا ژیا.
بودا، نزیکەی 40 ساڵ، موغ بووە و دەروێشانە ژیاوە. لە تەمەنی 80 ساڵیدا مردووە.
بە ڕای بودا، سەرچاوەی گشت ئازارێک، حەز، یان ویستە. گەر مرۆڤ توانی بەسەر حەزەکانی خۆیدا زاڵ بێت و جڵەویان بکات، ئیدی لە ئازاریش ڕزگاری دەبێت و دەگاتە ژیانی جاویدانی، یان نیرڤانا.
ئەمڕۆ لە جیهاندا 400 تا 450 ملیۆن کەس بڕوایان بە بۆچوونەکان و ڕێنماییەکانی بودا هەیە، بە سەدان هەزار کەسیش لەسەر هەمان ڕێچکەی ژیانی ئەو دەڕۆن و گشت حەز و ئارەزوویەکی خۆیان زیندەبەچاڵ کردووە و بەشوێن ڕاستی و ژیانی جاویدانیدا وێڵن. بەو کەسانە دەڵێن «مونک».

## ڕاڤە

مێدیتەیشن: ڕامان و بە ناخی خۆدا ڕۆچوون. بیرکردنەوەی زۆر قووڵ.
نیرڤانا : (*دامرکاندنەوە*) مەبەست دامرکاندنەوە و جڵەوکردنی حەز و ئارەزووەکانی لەشە.
ترۆپکی، مێدیتەیشن/بەناخی خۆدا ڕۆچوون، نیرڤانایە.

وانەی 4

## پرسیار

1- ئایا تەنها بە تێڕامان دەتوانینن لە ڕاستی تێبگەین، یان بگەین بەڕاستی؟
2- کاتێک کە ئێمە بابەتێک " شتێک " نەبینین، یان نەکەوێتە بەر چاومان، ئیدی ئەوە مانای نەبوون، یان ڕوونەدانی ئەو شتەیە؟
3- ئایا هەموو بابەتێک " شتێک "دژە بابەتێکی لەگەڵدایە، یان لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە؟
4- بە بڕوای تۆ لە پشت هەموو ڕووداوێک، یان بەسەرهاتێکی مێژووییەوە، بیرۆکەیەک، یان (ئایدیایەک) هەیە ؟
5- بڕوا دەکەیت کێشە، یان ناکۆکی نێوان، «بیر» و «بڕوا»، هێزی بزوێنەری مێژوو بێت؟
6- بە تەنها زیندەبەچاڵ کردنی حەزەکانمان، دەرونمان ئاسوودە دەکات؟
7- بڕوا دەکەیت، بودا بیتوانیایە بە پاشایەتیش بەو (هۆشیاری) یە بگەیشتایە، کە بە گەدایی پێیگەیشت؟
8- ئایا تەنها بە دوورکەوتنەوە لە "شت" ماتریاڵ، دەتوانین بەها ئاکاری و ڕەوشتیەکان بپارێزین؟
9- ئایا ژیان سەرتاپای ئازارە (ئازاری جەستەیی و دەرونی)، یان ئازار (چ جەستەیی و چ دەرونی) بەشیکی سروشتیە لە ژیان ؟
10- کاتێک، کە بابەتێک، کە لەگەڵ دژەبابەتدا دەکەونە جەنگەوە، ئیدی (تێکهەڵکێش) بابەتێکی نوێ، دێننە ئاراوە؟

## هیگڵ :

" هیچ هێزێک نیە بتوانێت بەر لە پێشکەوتن و گۆڕان بگرێت "
" مێژوو گفتوگۆیەکی دیالێکتیکانەیە لە فۆرمێکی گەورەتردا "

## کارڵ مارکس (1818 -1883)



"مێژوو، مێژووی کێشەی نێوان چینەکانە."
کارڵ مارکس، لە سەرەتادا یەکێک بووە لە پەیڕەوانی هیگڵ، کە بە هیگڵە چەپڕەوەکان ناسرابوون. دواتر ڕێبازێکی تایبەت بە خۆی داهێنا کە بە دیالیکتیکی ماتریالیزمی ناسرا. کەم فەیلەسوف هەبووە هێندەی مارکس، لایەنگر و نەیاری هەبووبێت. ڕێبازی فەلسەفەی مارکس بە «مارکسیزم» ناسراوە. سیان لە نووسراوەکانی مارکس « مانیفێستی کۆمۆنیزم»، « ئایدیۆلۆجی ئاڵمانی» و « کاپیتاڵ- سەرمایە» زۆرترین مشتومڕیان دەربارە کراوە.

مێژوو



## جۆرج ولهێلم فریدرچ هیگڵ (1831 – 1770)

"هیچ هێزێک نیە بتوانێت بەر لە پێشکەوتن و گۆڕان بگرێت" بەم دیدەوە هیگڵ، لە ئەورووپای دوای شۆڕشی فەرەنسای دەژیا. ئەو لەو باوەڕەدابوو کە ئیدی مێژوو بۆ دواوە ناگەڕێتەوە. کە شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی 1789 دا بەرپابوو، هیگڵ لاوێکی تەمەن 19 ساڵان و خوێندکاری زانکۆ بوو. ئەو «شیعارەی» شۆڕش بەرزی کردبۆوە " ئاشی لەگەڵ کوخنشینان و شەڕ دژی کۆشک و تەلارنشینان " ، یان " ئازادی و یەکسانی بۆ گشت مرۆڤەکان" بە هەزاران کەسی وەک هیگڵی کردبووە لایەنگری شۆڕش و ئاواتەخوازبوون ڕۆژێک زووتر قارەمانانی

سۆڕش بگەنە بروسیا (ئەڵمانیا) و لە دەست ئاغا و دەرەبەگ و میرە دواکەوتوو و خوێنمژەکان، ڕزگاریان بێت.

((کاتێک کە لە مێژوو دەکۆڵینەوە، دەبینین هەردەم بەرەو پێشەوە دەڕوات. جیهان هەردەم لە گۆڕاندایە، گۆڕان بەرەو باشتر. گۆڕانێکی پۆزەتیڤانە.)) بەم ڕایە، هیگڵ لە فەیلەسوفانی ڕێبازی ڕۆشنگەری، نزیک دەبێتەوە. بەڵام نا، ئەم وەک ئەوان نیە سەردەمێکی مێژوویی بە چاک و پێویست بزانێت و سەردەمێکی دیکەش بە خراپ و ناپێویست. بەڵکو بە بۆچوونی ئەم (( گشت سەردەمە مێژووییەکان گرنگ و پێویست بوون و هەر سەردەمێکیش تەواوکەری سەردەمێکی ڕابووردوو و بنیاتنەری سەردەمێکی داهاتوو دەبێت.))

ئالەم خاڵەوە فەلسەفەی هیگڵ (فەلسەفەی دیالێکتیک، دیالێکتیکی مێژوویی) دەست پێدەکات.

بەڵام ئەو هێزە چیە کە پرۆسەی مێژوو دەبزوێنێت؟

ئەو هێزە، بە بڕوای هیگڵ، جەنگ و ناکۆکیە. هیگڵ ئەم بیرۆکەیەی لە هێراکلیت، (500 ساڵ پ.م.) وەرگرتووە. هێراکلیت بڕوای وابوو کە « هەرچی گۆڕانکارییەک لە سروشتدا ڕوودەدات، لە ئەنجامی جەنگ و ناکۆکی نێوان دژەکانەوەیە وەک، گەرمی و ساردی، ڕووناکی و تاریکی و.......». بەڵام ئەو جەنگ و ناکۆکیانە کە دەبنە مایەی بزاوت و گۆڕانەکانی نێو مێژوو، بە بڕوای هیگڵ لەو جۆرە ناکۆکی و دژایەتیانە نین. بەڵکو جەنگ و ناکۆکی و دژایەتی نێوان بیر و بۆچوونەکانە.

ئایا جەنگ و دژایەتی نێوان بیر و بۆچوونەکان، گۆرانکاری لە مێژوودا بەرپادەکەن و قۆناغی مێژوویی نوێ دێننە ئاراوە؟ ئایا ڕووداوێکی لەو جۆرە لە مێژووی فەلسەفەدا ڕوویداوە؟

بەڵێ ڕوویداوە. نزیکەی (500 ساڵ پ.م.) کۆمەڵێک فەیلەسوف لە یۆناندا هەبوون و سەرقاڵی سروشت و گۆڕانکارییەکانی نێو سروشت بوون و عەوداڵی پەیداکردن و ناسینەوەی ئەو ماتریاڵە بوون کە سەرچاوەی گشت "شتێک" بوو. ئەمانە بە فەیلەسوفانە سروشتیەکان ناسرابوون.

نزیکەی 100 ساڵ دواتر، واتە (400 ساڵ پ.م.) کۆمەڵێک فەیلەسوفی دیکە پەیدابوون، کە سەرقاڵی مرۆڤ و کێشەکانی مرۆڤ بوون و ئەوەی

بەلایدا نەدەچوون سروشت و پرسە سروشتیەکان بوو. ئەمانە بە سۆفیستەکان ناسرابوون.
ئەم جەنگ و ناکۆی و دژایەتییە، قۆناغێک فەلسەفە و مێژووی بەرەو پێشەوە برد. ئەمەش ڕاستی بۆچوونەکەی هیگڵ دەسەلمێنێت کە هەموو قۆناغێک تۆوی دژایەتی خۆی لەناو خۆیدا هەڵگرتووە. یان وەک هیگڵ ناویان دەنێت «تێسیس/ بابەت و ئەنتی تێسیس/ دژەبابەت». کەواتە هەموو بابەتێك/ قۆناغێک، دژەبابەت و دژەقۆناغی خۆشی هەڵگرتووە، بەڵام کێشەکە، لای هیگڵ، لێرەدا کۆتایی نایەت و پێ دەنێتە قۆناغێکی نوێ ترەوە، ئەویش قۆناغی سینتێسیس/ تێهەڵکێشە، کە هەڵگری بابەت و دژەبابەتیشە. یان بە واتایەکی دیکە، تێکەڵەیەکە لە بابەت و دژەبابەت. ئەی بۆ ئەم قۆناغە نوێیە هیچ نموونەیەکمان لە مێژووی فەلسەدا هەیە؟
بەڵێ، پلاتۆن نموونەیەکی زیندووی ئەم قۆناغەیە. پلاتۆن سەرقاڵی پرسە سروشتیەکان و پرسە مرۆییەکانیش بوو، بەڵام فەلسەفەکەی پلاتۆن نە فەلسەفەی فەیلەسوفە سروشتیەکان و نە فەلسەفەی فەیلەسوفە سۆفیستەکانش بوو، بەڵکو سینتێسیس/ تێهەڵکێشێک بوو لە هەردووکیان و قۆناغێکی نوێ بوو.
بە بڕوای هیگڵ پەرەسەندنی قۆناغەکان لە تێسیس/ بابەت بۆ ئەنتیتێسیس/ دژەبابەت و دواتر بۆ سینتێسیس/ تێهەڵکێش، بزاوتێکی دیالێکتیکیە. هیگڵ ئەم زاراوەیەی لە سۆکراتیس وەرگرتووە.
هیگڵ وای دەبینێت کە سۆکراتیس لە گفتوگۆکانی لەگەڵ کەسانی دیکەدا، هەردەم لە بابەتێکەوە دەستی پێکردووە. سۆکراتیس هەوڵیداوە کە ئاخێوەر بۆ خۆی بگاتە چەند ڕاستییەک و لە ئەنجامدا بیرێکی نوێی لەمەڕ بابەتی ئاخاوتنەکە لە لا دروست ببێت.
لەم ڕوانگەیەوە هیگڵ دەگاتە بڕوایەک کە (مێژوو ئاخاوتنێکە لە فۆرمێکی زۆر مەزندا).

## ئازادی لە دیدی هیگڵدا

بە بڕوای هیگڵ، کلتوری ئەوروپا هەر لە سەردەمی شاردەوڵەتی یۆنانەوە (ساڵی 500 پ.م.) سەرقاڵی ئازادی مرۆڤ (تاکەکان) بووە. لەو ڕۆژگارەدا، هاوشاریە ئازادەکان (هاونیشتمانیان)، سەربەست بوون لە

بیروڕا دەربڕین و بەشداریکردنی بڕیاری ڕامیاری و کارگێڕایەتی شاردا.
بەڵام، ژنان و کۆیلە و خەڵکی بێگانە، لێیی بێ بەریبوون.
لەگەڵ نەمانی دەستەڵاتی یۆنانەکان و پەرەسەندنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان، ئەم ئازادیانە زیاتر پەرەیان سەند و لە پاشاشدا چەسپێنران. لە لای ڕۆمانەکانیش وەک یۆنانیەکان، ئازادی بە تەنها قۆرغی (پیاوانی ئازاد) بوو. بە بڕوای هیگڵ، لەگەڵ سەرهەڵدانی ئاینی مەسیحدا، ئیدی ئازادی بە هەموو مرۆڤەکان ڕەوابینی. هیگڵ وای دەبینی کە لە سەردەمی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ساڵانی 1600 و 1700، کێشەی ئازادی بوو بە کێشەی سەرەکی فەلسەفە و فەیلەسوفانی سەردەمی ڕۆشنگەری سەلماندیان کە مرۆڤ هەر بە سروشت ئازادە و بە ئازادیش لە دایک دەبێت. ئەم دیدە بووە بنەما و یەکێ لە سێ کوچکە سەرەکیەکەی شۆڕشی فەرەنسا (ئازادی و یەکسانی و برایەتی).
هەر لەم بوارەدا هیگڵ بیروڕای خۆی لەمەڕ شارستانی (ئۆریەنتاڵ) ڕۆژهەڵات، چین و هند و فارس، دەردەبڕیت. پێیوایە لەو شارستانیەت و کلتورانەدا بیری ئازادی تاک، سەریهەڵنەداوە، چونکە تەواوی خەڵک وەک کۆیلەی شا و ئیمپراتۆرەکان ژیاون.
ڕوداوێکی زۆر گرنگ لە ژیانی هیگڵدا، ئەوە بوو کە لە ساڵی 1818 دا کرا بە سەرۆکی زانکۆی بەرلین. هیگڵ پشتگیری تەواوی خۆی بۆ ڕژێمی شا فریدریکی سێیەم دەربڕی، کەچی هەر هەمان ساڵ بە فەرمانی شا، ئازادی نووسین و ڕادەربڕین قەدەغەکرا و هیگڵیش کە هەردەم باسی ئازادی دەکرد، وشەیەکیشی دژی ئەم بڕیارە نەگوت!

تێبینی بۆ مامۆستا
بەسەرهاتی بودا و پەیوەندی بیرۆکەی تێسیس/ بابەت، ئەنتی تێسیس/ دژەبابەت، سینتێسیس/ تێهەڵکێش.
ژیانی شاهانەی سیداهارتا لە کۆشکەکەی بابیدا، (تێسیس/ بابەت)، ژیانی گەدایی و دەروێشی (ئەنتی تێسیس/ دژەبابەت)، کاتی گەیشتن بە هۆشیاری/ بودا (سینتێسیس/ تێهەڵکێش). بودا، تێکەڵەیەکە لە ژیانی گەدایی و ژیانی شاهی، بودا گەرچی گەدا بوو، بەڵام پلە و پایەی لە لای خەڵکی لە گشت شایەک بەرزتر بوو.

راقە

دیالێکتیک:
لە وشەی (دیالیکتیکا)ی یۆنانی وەرگیراوە. ئەم چەمکە فەلسەفیە لە زۆرترین گوتار و ڕاڤەی فەلسەفیدا بەکارهاتووە. یەکەم جار، پلاتۆن وەک چەمک لە پرۆسەی «پرسیار-وەڵام»دا لە دیالۆگەکانی سۆکراتیسدا، بەکاریهێناوە. دواتر ئەریستۆتێلیس ڕەهەندێکی قوڵتری پێدا و بۆ مەبەستی وەڵام (وەڵامی لۆجیکانە) بەکاریهێنا.

ڕۆشنگەری:
قۆناغێکی فەلسەفیە، لە ساڵی (1700 تا 1789) لە بەریتانیادا، لە سەردەستی نیوتۆن، هۆببیس، لۆک و هیوم، دەستیپێکرد. ئەمانیش لە بنەڕەتدا، بیرۆکەکانیان لە فەیلەسوفە فەرەنسییەکان ڤۆڵتێر، هۆڵباخ، لامێترێ و دیدیرۆت، سەرچاوەی گرتبوو. دواتریش پەڕیبوّوە بۆ لای فەیلەسوفە ئاڵمانیەکان، لەیبنیز و کانت.

ئۆریەنتاڵ :
لە وشەی (ئۆریەنس)ی لاتینەوە وەرگیراوە، بە مانای ئەو بەشەی ئاسمان، کە خۆری لێوە هەڵدێت. (خۆرهەلات)

کلتور:
مارکس: « هیگڵ بە هەڵەدا چووە، کە دەڵێت بیر و بڕوا، مێژوو دەبزوێنن و بەرەو پێشەوەی دەبەن. مێژوو، بزوێنەری ماتریاڵیی هەیە، واتە، ئەوە هێزی ماتریاڵە، کە مێژوو بەرەو پێشەوە دەبات، نەک بیر و بڕوا.»

## وانەی 5

### چیرۆک

### ئازادی و ڕێسا

دوای نیوەڕۆری ڕۆژێکی هەینی بوو. هاژە و چیا، لە ژوورەکانی خۆیاندا سەرقاڵبوون. دایکیان بانگی کردنە هۆڵەکە و پێیگوتن:
کچە خۆشەویستەکانم، من و باوکتان دەچینە سەردانی کاك هیوای هاوڕێمان. دەزانن کاك هیوا، تازە لە نەخۆشخانە هاتۆتە دەرەوە، چونکێ (عەمەلیات) نەشتەرگەری گورچیلەی بۆکراوە. گورچیلەیەکیان دەرهێناوە و گورچیلەیەکی دیکەیان بۆ داناوە.
لەبەرئەوەی کاك هیوا، کەمێك ئازاری هەیە، بۆیە ناکرێت ئێوە لەگەڵ خۆماندا ببەین. تەنها سەعاتێك لە لای کاك هیوا دەبین و دوای دوو سەعاتی دیکە، دەگەڕێینەوە. جا لەو ماوەیەدا نابێت کەس لە هاوڕێکانتان بهێننە ژوورەوە و ناوماڵەکە تێکبدەنەوە.
هاژە و چیا، بە نیشانەی ڕازیبوون سەریان ڕاوەشاند و بە «بەڵێ باشە» وەڵامیاندایەوە.
دایك و باوکی هاژە، لە ماڵ چوونە دەرێ و سواری ئۆتۆمبیلەکەیان بوون.
باوکی هاژە بە دایکی هاژەی گوت:
تۆ زۆر توندی لەگەڵ منداڵەکاندا و ڕێسای سەختیان بۆ دادەنێیت!
دایکی هاژە گوتی:
نەخێر ئازیزەکەم، دەبێت بیهێنمەوە بیریان پەیڕەوی ئەو ڕێسایانە بکەن، بۆ ئەوەی ماڵەکەمان نەبێت بە هەرا.
هەر هێندەی دایك و باب ڕۆیشتن، هاژە لە هۆڵەکەدا، کەوتە سەماکردن. باڵەکانی لە هەوادا واڵا کردبوو، سەمای دەکرد و لەبەرخۆیەوە دەیگوت:
ئازادین، ئازادین! هەموو ماڵەکە هی خۆمانە و چیمان بوویت، دەتوانین بیکەین!
چیا، بە گومان و سەرنجەوە تەماشای دەکرد و لێیی پرسی:

هاژە، ئەوە چیتە؟ خۆ هێشتا دایە و بابە، لە چاو وون نەبوون، جگە لەوەش، ئەوان نزیکەی، ڕێگای هیچ شتێکیان لە ئێمە نەگرتووە و لە گشت هاوڕێکانمان ئازادترین.

هاژە گوتی:

بەڵێ ڕاستە، بەڵام. کە ئەوان لێرە نەبن، زیاتر هەست بە ئازادبوونی خۆم دەکەم!

چیا گوتی:

زیاتر هەست بە ئازادی دەکەیت، ئەوە خۆت دەیزانی، بەڵام، تۆ گوتت «ئازادین، ئازادین».

هاژە گوتی:

ئەی وانیە؟ تۆش واهەست ناکەیت؟

چیا گوتی:

بەڵام، تۆ لەمنت نەپرسی هەست بە چی دەکەم. بە ناوی منیشەوە قسەت کرد. خۆ دەکرا بڵێیت، ئازادم، ئازادم.

هاژە ویستی وەڵام بداتەوە، بەڵام دەنگی زەنگی دەرگاکە، وەڵامەکەی پێ بڕی. بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

کێیە؟

دەنگێك وەڵامیدایەوە:

« ئێمەین، کنێر و لاوژە »

چیا کە گوێی لە دەنگی ئەوان بوو، وەبیر هاژەی هێنایەوە، کە دایکیان چی پێگوتوون، بۆیە بەهاژەی گوت:

هاژە، لەبیرتە، دایکم گوتی نابێت هیچ کەس لە هاوڕێکانمان بهێنینە ژوورەوە.

هاژە گوتی:

بەڵێ بیرمە، بەڵام، ئەوان هاتوون بۆ سەردانمان.

چیا گوتی:

هەرچۆنێك بێت، ئێمە نابێت بیانهێنینە ژوورەوە. گەر دایکم بزانێت توڕە دەبێت.

هاژە بەدەنگی بەرز هاواری کرد و گوتی:

کنێر، داوای لێبوردن دەکەم، ناتوانین هیچ کەس بهێنینە ژوورەوە، چونکە دایکم ڕازی نابێت.
کنێر وەڵامیدایەوە:
ئێمە هەر حەزمانکرد بزانین دێنەدەرەوە تا کەمێك یاری بکەین.
ئەمجارە، چیا وەڵامیدایەوە و گوتی:
نەخێر، بۆشمان نیە بێینە دەرەوە.
هاژە، بە نیگایەکی نادۆستانەوە، تەماشای چیای کرد و گوتی:
خۆ دایە نەیگوت بۆتان نیە بچنە دەرەوە.
چیا گوتی:
ڕاستە. بەڵام مەبەستی ئەوەش بوو، با پێشی نەگوتبین.
هاژە، زۆر تووڕەبوو. چووە ژوورەکەی دایك و باوکی و لەبەرخۆیەوە دەیگوت:
ئێستا بە جوانترین خشڵ و جلەکانی دایکم، خۆمدەڕازێنمەوە.
چیا پرسی:
هاژە، تۆ لە دایکمت پرسیوە، کە خشڵ و جلی ئەو بەکاربهێنیت؟
هاژە گوتی:
نەخێر. خۆ دایکم لێرە نیە تابزانێت، کە من شتەکانی ئەو بەکاردەهێنم.
چیا گوتی:
جا با لێرەش نەبێت. بەبێ پرسی خۆی، تۆ بۆت نیە شتی ئەو بەکاربهێنیت. جگە لەوەش، من دەتوانم پێیی بڵێم.
هاژە، زۆر تووڕەبوو، گوتی:
چیا، تۆ زۆر کەللەڕەق و بێ زەوقی. من تاقەتم نیە لەگەڵ تۆدا بم. دەچمە ژوورەکەی خۆم.
هاژە، بەتووڕەییەوە چووە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی بە توندی پێوەدا. لەسەر چرپایەکەی خۆی ڕاکشا و چاوەکانی نووقاند و لەبەرخۆیەوە دەیگوت
من، هەر لە ژوورەکەی خۆمدا بە تەواوی ئازادم و چیم بوێت دەیکەم!

وانەی 5



## پرسیار

ئەمە نموونەی چەند پرسیارێک، با خوێندکارانیش خۆیان پرسیار بکەن

1- ئایا ڕێساکان کاریگەرییان لە ژیانماندا هەیە؟
2- بۆ دەبێت پەیڕەوی ڕێساکان بکەین؟ دەبێت پەیڕەوی ڕێسایەک بکەین کە بڕوامان پێی نەبێت؟
3- ئایا هاژە کەسێکی دژە ڕێسا و چیا کەسێکی ڕێسا خوازە، یان تێڕوانینیان بۆ ئازادی جیاوازە؟
4- کێ مافی داوە بە گەورەکان (باوان) ڕێسا بۆ منداڵان دابنێن؟
5- ئایا پێویست بوو هاژە لە چیای بپرسیایە، کە ئەویش هەست بە ئازادی دەکات، یان ئەو پرسیارە پێویست نیە، چونکە هەموو کەس وەک یەک هەست بە ئازادی دەکات؟
6- ئایا ئازادی بە دورکەوتنەوە لە خەڵکی (بە تەنهایی) دێتەدی، یان لەگەڵ خەڵکدا (بەکۆ) دێتەدی؟
7- گەر هەموو کەسێک ئەوەی دەیەوێت و حەزی لێیەتی بیکات، ژیان ئاسانتر نەدەبوو؟
8- پێویستە کەسانی دیکە دان بە ئازادی مندا بنێن، یان تەنها ئەوە گرنگە کە من خۆم هەست بکەم ئازادم؟
9- دایکی کچەکان گوتی: ((کەس مەهێننە ژوورەوە)) خۆ نەیگوت: ((بۆتان نیە بچنە دەرەوە)) ئەی بۆچی چیا دەڵێت: (( مەبەستی ئەوەش بووە کەس نەهێنینە ژوورەوە)) دەشێ مرۆڤ شتێک بڵێت و مەبەستی شتێکی دیکە بێت ؟
10- تۆبڵێیت پەیڕەوی کردنی ڕێساکان، ڕێگە لە بێ سەروبەری و هەرا (فەوزا) بگرن؟

تێبینی بۆ مامۆستا
بیرۆکەی ئەم چیرۆکە لە بۆچوونی فەیلەسوفە بوونگەراکان، (بە تایبەتی سارترە) وەرگیراوە.

کلتور
سارترە : (( مرۆڤ نەک هەر ئازادە، بەڵکو مەحکومە بە ئازادی.))

د. محەمەد کەمال، لە کتێبی فەلسەفەی سارتەر و خوێندنەوەیەکی نوێ، بەشی، بونیادی ئۆنتۆلۆجیانەی سەربەستی، لاپەڕە، 78- 79 دا نووسیوویەتی: (( مرۆڤ بوونێکی سەربەستی هەیە و هێزێکی دەرەکی میتافیزیکی سنورداوی نەکردووە.))

## مێژوو

## ژان پۆڵ سارتره

## (1980 – 1905)





سارتره، بەناوبانگترین فەیلەسوفی ڕێبازی « ئێکسستنسیانلیزم» بوونگەرایی یە. ئەو بڕوای وابوو، کاتێک کەسانی دیکە بۆ تۆ دەبن بە دۆزەخ کە بوونت داگیردەکەن و بەها و بیروباوەڕی خۆیانت بەسەردا دەسەپێنن و نەخشە بۆ ژیانت دادەنێن و ناچاریشت دەکەن پەیڕەوییان بکەیت.

گەرچی فەلسەفەی بوونگەرایی مێژووەکەی بۆ کاتێکی زۆر کۆن تر دەگەڕیتەوە، بەڵام سارتره ڕەهەندێکی نوێی بەم ڕێبازە بەخشی. تەونی فەلسەفەی سارتره، ڕایەڵەی لە بیروبۆچوونی هەریەک لە دێسکارت، کانت، هێگڵ، مارکس، هۆسرڵ، نیتشە و هایدگەری تێدایە. سارتره لە سەرەتادا لە ڕوانگەی فەلسەفەی مارکسەوە لە بەها و ڕەوشت و سەربەستی مرۆڤی دەڕوانی، بەڵام کە بە ڕێبازی فێنۆمێنۆلۆجی هۆسرڵ ئاشنا دەبێت و ڕێبازە تازەکەی خۆی، کە بە (بوونگەرایی بێبڕوا، ئێکسستنسیالزمی ئاتێیستی) ناسراوە، دادەمەزرێنێت.

بە واتایەکی دیکە کێشەکانی بوون، سەربەستی و ڕەوشت، لەسەر بنەمای ئۆنتۆلۆجی دێسکارتیەوە، بۆ زەمینەی فێنۆمێنۆلۆجیانەی هۆسرڵی دەگوازێتەوە. ئەویش لەو ڕوانگەیەوە، کە سەربەستی بە (واقیعەوە) گرێ دەدات. ئەم دیدە فەلسەفیە، مرۆڤ دەخاتە چەقی بازنەی ڕووداوەکانەوە و لە هەمبەر بەرپرسیاریەتی مێژوویدا ڕایدەگرێت. کەواتە سەربەستی لەلای سارتره، هەست بە لێپرسینەوەیە. ئەمەش ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە کە گوایە سارتره لە خوازیارانی بەرهەڵداییە، ڕەتدەکاتەوە. بە دیدی سارتره، هیچ بەڵگەیەکی لۆژیکی بۆ ڕەتدانەوەی سەربەستی مرۆڤ نیە و مرۆڤ سەربەستییەکی لە

سنوربەدەری هەیە و هێزێکی میتافیزیکی نیە بتوانێت بوونی داگیر بکات. تا ئێرە بونیادی ئۆنتۆلۆجیانەیە، بە نەبوونی ئەو هێزە، ئیدی مرۆڤ خۆی بەها بۆ خۆی دادەهێنیت و هەست بە لێپرسینەوە دەکات.
ئالەم پنتەدایە، کە سەربەستی لە بونیادی ئۆنتۆلۆجیەوە بۆ بونیادی فێنۆمێنۆلۆجی، دەگوازرێتەوە. سارترە، وەک نیتشە، «بێبڕوایی» بە کێشەیەکی تەوەری، لە سەربەستی مرۆڤدا دادەنێت و لەو باوەڕەدایە، بوون و نەبوونی سەربەستی وابەستە بە بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجیەوە.
تا ئێرە، لە فەلسەفەی سارترە دا بە (بوون-بۆ-خۆ) ناسراوە، بەڵام کاتێک ئەم (بوون-بۆ-خۆ)یە لە جیهاندایە، ئەوا بە گوتەی هایدگەر دەبێت بە (بوون-لەناو-جیهان) دا و لەگەڵ (بوون-بۆ-خۆ)ی دیکە ڕوو بەڕوو دەبێتەوە. تا ئەم ساتە «ئەو/ئەوانی دیکە» بۆ من ببوون بە بابەت و وەک دیاردە دەکەوتنە بەر ئاگامەندیم، ئیدی لەساتی ڕوو بە ڕوو بوونەوەدا، «من» دەبم بە بابەت بۆ«خۆ» یەکی دیکە و وەک بابەت دەکەومە بەر ئاگامەندی ئەو/ئەوانی دیکە. ڕەنگە ئەم پنتە وای لە سارترە کردبێت کە بڵێت: ((کەسانی دیکە دۆزەخن!)).
هەڵبژاردن لەلای سارترە، مەرجی سەرەکی ئازادییە، بۆیە مرۆڤ ناچارە هەڵبژێرێت. بە واتایەکی دیکە، هیچ هێزێک نیە کە چارەنووس بۆ ئێمە (مرۆڤ) دیاری بکات، بەڵکو دەبێت ئێمە ناوەڕۆکێک بدەین بە بوونمان/ بە خۆمان، چونکە مرۆڤ « کە فڕێدەدرێتە ئەم جیهانەوە» بێ ناوەڕۆکە، بۆیە دەبێت ناوەڕۆک بۆ خۆی هەڵبژێرێت. هەر ئەم هۆکارەشە، کە ئازادی لە لای سارترە بەرپرسیاریەتیە.
بە دیدی سارترە، بۆ مرۆڤ «بۆ من» هیچ شتێک بوونی نیە جگە لەو شتەی/بابەتەی کە خۆی بۆ ئاگامەندی من دەردەخات. بە واتایەکی دیکە، هەرشتێک وەک دیاردە (فێنۆمێن) نەکەوێتە بەر ئاگامەندی من، ئیدی ئەو بابەتە/شتە، بوون (وجودی) نیە. بۆ دیاری کردنی ئەم بنەمایە، سێ بناغە/بنەڕەتی داناوە:
1- ئاگامەندی:
مەبەست لەو ئاگامەندیەیە، کە هەبووەکان" شتەکان" خۆیانی بۆ دەردەخەن.
2- دیاردە (فێنۆمێن):

مەبەست لەو شێوەیە/ دیاردەیەیە، کە شتەکان خۆیانی پێدەخەنە بەر ئاگامەندی.

3- بابەت/ شت (ئوبجێکت)

مەبەست لەو شتانەیە کە مرۆڤ بڕوادەکات شتی ماتەری/ ماددەیی بن.

ئەدی من چۆن بەها/ مانا بە شتەکان دەبەخشم؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، سارترە، بڕوای وایە، لەبەرئەوەی جیهانی شتەکان/ بابەتەکان، لە سنور بەدەرە، تەنها ئاگامەندی دەتوانێت سنور و بەهایان بۆ دابنێت. ئەم بڕست و توانایەی ئاگامەندی، دەستەڵاتی «نەبوون» کردنی داوە بە مرۆڤ. لە ئەم پرۆسەی «بەنەبوون کردنە/ بەهیچ کردنە»دا سەربەستی مرۆڤ دەردەکەوێت. ئەو سەربەستیەی کە تێیدا مرۆڤ دەتوانێت جیهانێک بۆ خۆی بنیاد بنێت.

ئایا لەو جیهانەی کە تایبەت بە خۆمانە، شتەکان نیگەرانمان دەکەن و کەسانی دیکە دەتوانن ئازادیەکەمان سنوردار بکەن و هەراسانمان بکەن؟

سارترە دەڵێت:

((نیگەرانی شێوازێکە بۆ دەرککردنی سەربەستی و هەستکردن بە بوون))

کاتێک، نیگەرانی داهاتووم، کاتێک پەرۆشی ئەوەم کە چ بەهایەک لە لام گرنگ تر بێت، ئەم "شتانە" سەربەستیەکەم سنوردار دەکەن و کەمی دەکەنەوە. بەڵام کەسانی دیکەش بەهەمان شێوە سەربەستیەکەم سنوردار دەکەن. کاتێک لەگەڵ کەسێکی دیکە/ ئاگامەندییەکی دیکەدا ڕووبەڕوو دەبمەوە. کەسی بەرانبەر/ ئاگامەندەکەی دیکە هەوڵ دەدات من لە (بوون- بۆ- خۆ)وە بکات بە (بوون- لە ناو- خۆ). لەم خاڵەدا من نیگەران دەبم. چونکە ڕووبەڕوو بوونەوەکەم لەگەڵ «ئەو کەسەدا» وەک ڕووبەڕووبوونەوەم نیە لەگەڵ شتێکدا، تا بتوانم بەبێ کێشە بیکەمە بابەت، لەبەرئەوەی بابەت، خەسڵەتی چەسپاو و نەگۆڕی هەیە. بەڵام مرۆڤ ئاگامەندە و خاوەن خەسڵەتێکی نەچەسپاو و بزێوە. ئالێرەدا، بە بڕوای سارترە، نامۆیی سەرهەڵ دەدات، چونکە کەسانی دیکە دەتوانن ببنە ڕێگر لەبەردەم پرۆژەکانی مندا و سەربەستیم لێ زەوت بکەن و داگیرم بکەن. ئەم بۆچوونە لە ژێر کاریگەری ڕوانینەکانی هیگڵدا ڕاڤە کراوە.

سارتره، نەک هەر وەک فەیلەسوف، بەڵکو وەک ڕۆماننووس و شانۆیی (دراما) نووسیش ناوبانگێکی جیهانی هەیە، بۆیە ساڵی 1964 خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەب پێدرا، بەڵام سارتره خەڵاتەکەی ڕەتکردەوە.



## سۆرێن کیرکەگارد (1810 - 1854)

بە بڕوای کیرکەگارد، ترسی هەست بە لێرسینەوە، ناچارمان دەکات، کە لە ئازادی ڕا بکەین و خۆمان لە (قۆزاخە) دنیایەکی بچوک و تایبەت بە خۆماندا، مەڵاس بدەین. دنیایەک کە تەنها خۆمانی تێدا بیت، دنیای " هەڵاتن لە ئازادی"

## ئێدمۆند هوسرڵ (1859- 1938)



هوسرڵ بڕوای وابوو کە (هەر دیاردەیەک/ فێنۆمێنێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامی ئەزموونێک، کە ((من)) مەبەست لە منی هۆشەکییە، پێیدا تێپەڕ دەبێت.) هوسرڵ گوتویە: ((من هەم، هەر شتێکیش کە من نەبێت، ئیدی فێنۆمێنەیە و لە پەیوەندی فێنۆمێنیانەدا دەتوێتەوە.))

## ڕاڤە

### ئێکسیستنسیالزم :

لە وشەی (ئێکسیستێنتیا)ی لاتین وەرگیراوە. لە سەدەی پێنجەمی مەسیحیەوە لە فەلسەفەدا بەکاردێت، دواتر لە سەدەکانی ناویندا، بەتایبەتی لە نووسراوەکانی تۆماس ئەکویناس( 1225 – 1274) ئەم چەمکە جێگەی خۆی لە فەلسەفەدا گرت.

فێنۆمێن :
لە وشەی (فاینەمینۆن)ی یۆنانی وەرگیراوە، بە مانای دیار/ئاشکرا . یەکەم جار پلاتۆن بەکاری هێناوە بۆ جیاکردنەوەی دیاردە/فێنۆمێن لە ئایدیا/بیر. دواتر، کانت لە ڕاڤەی بۆچوونەکانیدا زۆر گرنگی بەم چەمکەداوە. هەروەها هیگڵ چەمکی «فێنۆمێنۆلۆجیا»ی ڕاڤەکردووە.

ئۆبجێکت :
" زات- خود " لە وشەی ( ئۆبجێکتۆم )ی لاتینی وەرگیراوە. دژە وشەی ( سۆبجێکتە ) کە لە کوردیدا ( بابەت )ی بەرانبەر دانراوە.

وانەی 6
چیرۆک



# فێمینیزم

"کاتێک، باس و گفتوگۆی هزری و فەلسەفی لەگەڵ پیاواندا دەکەم، زۆر لەوە بێزار دەبم کە پێم دەڵێن : ((ئەوە بۆیە تۆ بیروڕات لە هەمبەر ئەو پرسە، یان ئەو بۆچوونەدا، وایە، چونکێ ئەتۆ ژنیت.)) تاکە شێواز و ڕێگەیەکیش کە بتوانم بەرپەرچیان بدەمەوە ئەوەیە، کە بڵێم ((نەخێر، بۆیە بیروڕام وایە و وای تێدەگەم، چونکە ئەوە ڕاستییە)) بەم وەڵامەکە کەمێک لە (سۆبجێکتیڤ- زات)ی خۆم دەردەبرم. گەرچی پیاوبوون بۆخۆی هیچ خاسیەکی تایبەت ناخاتە سەر مرۆڤ بوون، وەلێ پیاوان هەر لە کۆنەوە بە درێژایی مێژوو دید و بڕوایان وایە کە خۆیان، ((تەواو کۆن)) و لە کەموکوڕی بەدەرن. کەچی ژنان بە ((مێ)) و ناتەواو دەبینن.
ئاخر ئەمان ئەم دیدەیان لە ئەریستۆتێلیس و تۆماس ئەکویناسەوە، بە میرات بۆ ماوەتەوە!
پیاو، ژن وەک ئەوەی کە هەیە نابینێت و بە تاکێکی سەربەست و خۆیەکی بڕیاردەری دانانێت، بەڵکو لە سۆنگەی پەیوەندی و بەرژەوەندی بە خۆیەوە، ژن دەبینێت و بڕیاری بۆ دەدات، کە چۆن بێت. کەچی لە هەمانکاتدا ئەو مافە بە ژن ڕەوا نابینێت.
ئیدی ئالەم ڕوانگەیەوە، پیاو دەبێت بە سۆبجێکت و ژنیش دەبێت بە «توخمەکەی دیکە» ئۆبجێکت. ئەمە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەروا بووە، کێشەکە لە نێوان سۆبجێکت و ئۆبجێکتدا بووە. کاتێک کەتۆ خۆت بە سۆبجێکت دابنێیت، ئیدی دەبێت لاکەی دیکە، کەسی بەرانبەر، بکەیتە ئۆبجێکت و خەسڵەتە مرۆییەکانی لێ زەوت بکەیت و لە خۆی نامۆی بکەیت. پیاویش دروست ئەم کارەی کردووە، هەر وەک چۆن سەرمایەدار کرێکار دەچەوسێنێتەوە و مرۆڤی سپیی مرۆڤی ڕەش دەکات بە کۆیلە.

باشە ئەم لە خۆ نامۆکردن و بە کۆیلە کردنەی ژنان، چۆن سەریهەڵداوە و هاتۆتە ئاراوە؟

« هیچ مرۆڤێک بە ژنی لە دایک نابێت، بەڵکو دەکرێت بە ژن! »

گەرچی هیچ ڕێسا و یاسایەکی بایۆلۆجی/سروشتی، سایکۆلۆجی، یان ئابوری بڕیار لەسەر توخم و ڕۆڵی توخم (نێریی و مێیی) ژنێتی و پیاوێتی، نادات، بەڵام شارستەنیەت/کلتور ئەو جیاکردنەوەیە دەسەپێنێت. کچ و کوڕ، لە چوار ساڵی سەرەتای تەمەنیاندا، هیچ جیاوازییەکیان نیە، هەر لە هەڵسوکەوت و یاریکردن و حەز و ئارەزوو، بەڵام لە دوای ئەو تەمەنەوە وورده وورده جیاوازییەکان دروست دەکرێن. تا دەگاتە دوازدە ساڵی، ئیدی بە جارێ لە یەک دوور دەکەونەوە. کچ بۆ ژنێتی و کوڕیش بۆ پیاوێتی ئامادە دەکرێن.

بەتایبەتی کوڕان، هەردەم هەستی بە پیاو بوونیان تێدا دەچێنن و بیریان دەخەنەوە کە ئەوان میراتگر و درێژەپێدەری بەهاکانی خێزان و کۆمەڵگەن. کچانیش بۆ سەلاری، ئاغری، گوێڕایەڵی و دڵسۆزی بۆ مێرد و خێزان ساز دەکرێن. کۆمەڵگە هەمیشە داوایان لە کوڕان ئەوەیە، کە خۆڕاگر بن، گەر ئازاریان پێگەیشت نابێت بگرین، ئاخر پیاو نابێت بگری. کچانیش دەبێت ناسک، میهرەبان و بە حیشمەت بن.

ئەم دۆخە، لە لای کوڕان دیدێک دروست دەکات، کە ((ئەو)) بابەتێکە بۆ کەسان و شتانی دیکە ( باوک، مامۆستا، خێزان، بەها کۆمەڵایەتیەکان، دەوڵەت) بەکورتی، ئەو ((خودی خۆی)) نیە. ئیدی هەر هەوڵی ئەوەیەتی وێنەیەکی ڕاستەقینە بۆ خۆی بکێشێت، ڕەنگە هەر ئەمەش لە داهاتوودا بیکاتە چەوسێنەری ژن، تا لەو ڕێگەیەوە وێنە شێواو و ناتەواوەکەی خۆی جوان بکات! لە لای کچانیش حاڵەتی بوون بە کەسی دووەم، ((ئەوی دیکە)) یان، لە لا دروست دەکرێت. لەم ڕوانگەیەوە، کچان خۆیان لەو ئاستەدا نابینن، کە داوای ئازادی و سەربەستی خۆیان بکەن، بەڵکو خۆ بە سۆبجێکت دەزانن و پێیان وایە کە دەبێت هەمیشە پاشکۆ بن!

ئایا چارەسەرێک بۆ ئەم کێشەیە هەیە؟

ئایا دەکرێت دنیایەکی بێ هەڵاواردن و بێ چەوسانەوە و پڕ لە یەکسانی و بەرابەری ژن و پیاو، بهێنرێتە دی؟

بەڵێ، دەکرێ دنیایەکی لەو چەشنە بهێنرێتە ئاراوە. ڕێگە چارە ئەوەیە شۆڕشێکی نوێ، «شۆڕشێکی سۆڤیەتی» بەرپا بکرێت، کە بەرابەری و یەکسانی و دەرفەتی وەک یەک، لە کار و خوێندن و هەقدەست، بۆ ژن و پیاو بخوڵقێنێ. ژنان ئازاد بن لە هەڵبژاردنی خوێندن و کار و هاوسەری ژیانیاندا و هیچ بەربەستێکی کۆمەڵایەتی، ئابوری و سیاسی، ناچاریان نەکات و نەبێتە ڕێگریان. بە پێی یاسا، ژیانیان مسۆگەر بکرێت و هیچ هۆکارێک نەهێڵرێت کە ژن بکاتە پاشکۆی پیاو. ژنان ئازاد بن، هەر کاتێک ویستیان، منداڵ لەباربەرن و لە هاوسەرەکانیان جیا ببنەوە. دەبێت یاسا پاڵپشتیان بێت.

بەڵام ئایا بە تەنها گۆڕینی یاساکان، سەربەستی و ئازادی بۆ ژنان دابین دەکات؟

نە، تەنها ئەمە گشت کێشەکە چارەسەر ناکات، بەڵکو کارکردن بۆ گۆڕینی دید و شێوازی بیرکردنەوەی کۆمەڵ و لەناوبردنی ئەو دیدە نا مرۆڤانەیەی کە تەنها جیاوازی جەستەیی، نێوان ژن و پیاوی کردووە بە بنەما و کرۆکی چەوسانەوەی ژن.

هەر کاتێک، کوڕ و کچ، ژن و پیاو، لەوە تێگەیشتن کە ئەو دوو جەستەیە پێکەوە ژیان پڕ مانا و تەواو دەکەن، ئیدی گشت جیاوازیەکانی یەکدییان قبوڵ دەبێت و ژیانیش ئاسودەتر و جوانتر دەبێت! "

تێبینی بۆ مامۆستا :

ئەمە کورتەیەکە، لە کتێبی لێ دیوکسیمە سێکسە، « توخمەکەی دیکە»، سیمۆنە دی بیەوڤۆیر، ساڵی 1949 نووسیویەتی.

فرێدریک ئێنگلس (1820 -1895)

"مافی هەبوونی موڵکایەتی تایبەتی و خاوەندارێتی ئامڕازەکانی بەرهەمهێنان، جیاوازی چینایەتی و چەوساندنەوەی ژنانی ئەفراندووە."

## وانەی 6



## پرسیار

1- ئایا ڕاستی لە دیدی ژنێک، یان پیاوێکدا گۆڕانی بەسەردا دێت، یان ڕاستی هەر ڕاستییە بۆ هەموو کەسێک؟
2- بە بڕوای تۆ، ئەوە جیاوازییە سروشتیەکانە، یان دید و بۆچوونی کۆمەڵگایە کە جیاوازی نێوان کوڕ و کچ، ژن و پیاو، دروست دەکات ؟
3- گەر ئەو ڕایەی ئەریستۆتێلیس بە ڕاست بزانین کە گوتویە «ژنان پیاوی نا کامڵن» مانای ئەوە نادات کە پیاو لە سەرەتادا، یان لە ئەسڵدا ژنە و کامڵ بووە؟
4- تەنها هەبوونی یاسا زامنی کردن، یان نەکردنی کارێک دەکات؟
5- بڕوا دەکەیت کۆمەڵگەیەک لافی ئازادی لێبدات، لە کاتێکدا نیوەی کۆمەڵگا، کە ژنانن ئازاد نەبن و وەک مرۆڤی پلە دوو، یان پاشکۆ تەماشایان بکرێن؟
6- گەر هەموو ئەو ئازادی و دەرفەتانەی بۆ پیاون و کوڕان هەن، بۆ ژنان و کچانیش هەبن، ئیدی یەکسانی ژن و پیاو دێتە ئاراوە و کۆمەڵگا ئاسودە دەبێت؟
7- گەر بە تەنها دید و بۆچوونەکانی کۆمەڵ، ببنە هۆکاری وێنا کردن و تێگەیشتن لە خود/زات، لە لای مرۆڤ (چ ژن، چ پیاو)، ئیدی ڕۆڵی تاک چیە لە وێناکردن و تێگەیشتنی خودی خۆیدا؟
8- ئایا، ژنان دەتوانن لە ڕێگەی خەباتی فێمنزمیەوە، مافە زەوتکراوەکانیان بەدەست بهێنن؟
9- بۆ هێنانە ئارای کۆمەڵگەیەکی یەکسان و بێ چەوساندنەوە و بەرابەر، کامیان گرنگترە، خەبات بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی ژنان، یان هەوڵدان بۆ گۆڕینی دید و تێگەیشتنی هەڵەی پیاوان بەرانبەر بە ژنان؟
10- دەتوانین گشت ئامانجەکانمان لە ئەنجامی شۆڕشەوە بەدەست بهێنین، یان دەکرێ بە دانوساندن و دیالۆگ بگەینە هەمان ئامانج ؟

ڕاقە



فێمێنیزم: لە وشەی (فێمێنین)ی لاتینیەوە وەرگیراوە. بەمانای مێ، ژن، یان ژنانە.

سۆڤیەت: وشەکە ڕوسییە و مانای «ئەنجومەن/ ڕاوێژ» دەدات. ئەم چەمکە سیاسییە لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی سۆسیالستی لە ڕوسیادا لە ساڵی 1917 دا بەڕێبەرایەتی فلادێمیر ئێلیێتیش لێنین (1870- 1924) هاتە ناو فەرهەنگی سیاسییەوە.
لێنین، یەکێکە لە بەناوبانگترین ڕیبەران و بیریارانی سۆسیالیزم- کۆمۆنیزم و گەلێک کتێب و نووسرای هەیە.

وانەی 6

مێژوو

## سێمۆنە دی بیەوڤیر (1908- 1986)



سیمۆنە، لە خێزانێکی نیمچە دەوڵەمەند، لە شاری پاریس لە دایک بووە. فەلسەفەی لە ئامۆژگایەکی کاتۆلیکی تایبەت بە کچان خوێندووە، دواتر، لە تەمەنی 21 ساڵیدا چۆتە زانکۆی سۆربۆن. لەوێ لەگەڵ ژان پۆڵ سارترەدا ئاشنا بووە. ئەم ئاشنایەتییە تا مردنی سارترە لەساڵی 1980 دا درێژەی کێشا. سیمۆنە، لە تەک کاری مامۆستایەتیدا (مامۆستای فەلسەفە بووە) خەریکی قوڵبوونەوە بووە لە فەلسەفەی هەریەک لە پلاتۆن، دیسکارت، و کانت.

دواتر، لە ساڵەکانی 1930 دا لەگەڵ سارترەدا، خەریکی خوێندنەوەی مارکس، هوسرڵ و هایدگەر بوون. سیمۆنە، دوای خوێندنەوەی فینۆمێنۆلۆجی هوسرڵ و ئۆنتۆلۆجی هایدیگەر، ڕەهەندێکی نوێی بە فەلسەفەی ئێکسیسنتیالیزم بەخشی.

سیمۆنە و سارترە، لە ڕێگەی گۆڤارەکەیانەوە (سەردەمی نوێ) لە ساڵەکانی دوای جەنگی دووەمەوە، ئەدەب و فەلسەفەی فێمینزمیان تاڕادەیەکی زۆر بەرەو پێشەوە برد.

کورتەی دیدی سیمۆنە ئەوەیە کە مرۆڤ، خۆی بڕیار لەسەر بە واقیع کردنی بوونی خۆی دەدات، لە ڕێگەی هەڵسوکەوت و دانوساندنەوە. مرۆڤ بە هەڵسوکەتیەوە مرۆڤە. بوون هیچ مانایەکی نیە گەر ئێمە پێی نەبەخشین.

## پرسی فێمێنیزم لە مێژووی فەلسەفەدا

فەلسەفە باس لە کێشەی مرۆڤ دەکات، نەک ڕەگەزێکی تایبەت( پیاو، یان ژن) بەڵام لەو مێژوویەی کە فەلسەفەی یۆنانی تێیدا سەریهەڵدا، بە پێی ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و ئابوری و کلتوری ئەو ڕۆژگارەی یۆنان، کۆمەڵگە دوو چێن بوو. چینی مرۆڤە ئازادەکان و چینی مرۆڤە کۆیلەکان. مرۆڤە ئازادەکانیش دوو توێژ بوون، پیاوان و ژنان. ژنان توێژێک بوون لە نێوان ئازاد و کۆیلە دا. «ژنانی ئازاد» وەک کۆیلەکان، مافی دەنگدان و بەشداری کردنی ژیانی سیاسی و بگرە خوێندن و فێربوونیشیان نەبوو. کچان لە تەمەنی 13- 16 ساڵان، بەشوو دەدران. ئیدی دەبوو هەر لەو تەمەنەوە، خەریکی منداڵ بەخێوکردن بۆ مێردەکانیان بن. بە پێچەوانەوە، پیاوان سەربەست بوون هەمیشە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی فەلسەفی و سیاسی و سەیری پێشبڕکێی وەرزشی بوون. بەکورتی لە گشت ڕووداوەکانی ڕۆژگار ئاگادار بوون.

ئەم بارودۆخە نابەرابەر و نایەکسانییە، دوو دنیای دروست کردبوو، دنیایەکی پیاوانەی خاوەن دەستەڵات و بە ئاگا، دنیایەکی ژنانەی بێ دەستەڵات و بێ ئاگا. ئەم بارودۆخەی ژنان، لە سەردەمی سۆکراتیس، تا سەردەمی جۆن ستیوارت میڵ سەرنجی پیاوە فەیلەسوفەکان و

بزووسەرانیشی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و هەریەکەیان بەگوێرەی تێڕوانین و هۆشیاری خۆیی و سەردەمەکەی، بیروڕا و بۆچوونی خۆی دەربڕیوە.
گەرچی شۆڕسێ فەرەنسا، ئازادی بە مافی گشت مرۆڤەکان دەزانی، بەڵام شیعارەکانی هەر مۆرکی پیاوانە بوو (ئازدی، یەکسانی، برایەتی!).

ئەماسۆنا

لە مێتۆلۆجیای یۆنانیدا باس لە کۆمەڵە ژنێک کراوە، کە بە ئاماسۆنا (بێ مەمک) ناسراون. ئەمانە ژنانێکی جەنگاوەر و سوارچاک بوون. ئەم ژنانە چارەی پیاویان نەویستووە. بەپێی فەرمانی شاژنەکەیان، بۆیان هەبووە جارێک لە ساڵدا لەگەڵ پیاودا جووت ببوونایە. دواتر کە منداڵیان بووە، گەر کوڕ بووایە دەستبەجێ کوشتویانە. مەمکی کچەکانیانیشیان بڕیوە و مەشقیان پێ کردوون و کردوویانن بە جەنگاوەر. (گەرچی ئەمە ناشیرین کردنی وێنەی ژنە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕەتدانەوەی ئەو غەدرە مێژووییەیە کە لە ژن کراوە.) دیسان، هەر لە مێتۆلۆجیای یۆنانیدا، ئارتێمیس خاتو خواندی ڕاووشکار، کچی زێۆس و خوشکی ئەپۆڵۆن، لە پیاوان بەگومان بووە و شوی نەکردووە.

سۆکراتیس (470- 399 پ.م.)



پلاتۆن دەنووسێت، کە سۆکراتس گوتویە: ((گەر جیاوازی ژن و پیاو هەر ئەوە بێت، کە پیاوان منداڵ دروست دەکەن و ژنان دەیانیان بێت، ئەوا ئەمە ڕێگەی ئەوە ناگرێت، جیاوازی و هەڵاواردنی خوێندن و فێرکردن لە نێوانیاندا بکرێت.)) بەواتایەکی دیکە، سۆکراتیس خوێندن و فێرکردنی بۆ ژنان بە ڕەوا بینیوە و جیاوازیە فیزکیە/سروشتیەکەی نێوان ژن و پیاوی بە لەمپەڕ نەزانیوە. سۆکراتیس لە یەکێ لە دیالۆگەکانیدا (دیالۆگی مێنون) دەڵێت:

(ج ژن چ پیاو دەبێت هەمان دید و بەهایان هەبێت و پەرەی پێبدەن. چونکە ئەو دید و بەهایانە بۆ هەردووکیان هەر وەکیەکە و کاری بە توخمی نێر و مێوە نیە)).

## پلاتۆن (428 – 348 پ.م.)

پلاتۆن، گەرچی بڕوای وابوو کە ژنان هەر بە سروشت لە پیاوان کەم هێزترن، بەڵام دەکرێت لە نزیکەی گشت بوارەکاندا هەمان کاری پیاوان بکەن. ئەوەتا لە کتێبی پێنجەمی دەوڵەت/کۆماردا دەنووسێت،
((بەخشیدەیی سروشت بۆ ژنان و پیاوان وەک یەکە، بۆیە مەرج نیە توانایی سەرکردەیی کردنی دەوڵەت لە ژنێکدا نەبێت لەبەرئەوەی ژنە، یان لە پیاوێکدا هەبێت لەبەرئەوەی پیاوە. بەڵکو گشت ئەرکەکانی پیاو، ژنیش دەتوانێ جێبەجێیان بکات.))

## ئەریستۆتێلیس (384 – 322 پ.ز.)

ئەریستۆتێلیس گەرچی فەیلەسوفێکی سروشتناس بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێڕوانینێکی سەیری بەرانبەر بە ژن هەبوو. ئەو بڕوای وابوو کە ژنان « پیاوی ناتەواو، یان ناکامڵن! ».
ئەریستۆتێلیس گوتویەتی: ((کۆیلە بەهیچ جۆرێک توانای فێربوونیان تێدا نیە. ژنان توانای فێربوونیان هەیە، بەڵام دەستەڵاتیان نیە!)) هەر بۆیە بڕوای ئەریستۆتێلیس وابوو، کە لە کاتی هێرش کردنی دوژمن بۆ سەر شار، پیاون یەکسەر دەستدەدەنە چەک بۆ بەرگری کردن.

## ئەریستۆفانیس (450 – 385 پ.ز.)

ئەریستۆفانیس، کۆمێدیانووس/شانۆیی نووس، لە شانۆگەری (کۆمێدیای لیسیستراتە/کۆمێدیای دژەجەنگ) دا دەنووسێت:
ژنان ڕێکەوتوون، کە ئیدی لەگەڵ مێردەکانیاندا نەخەون، تا جەنگ دەوەستێنن، (جەنگی نێوان ئاتێن و سپارتە)
پیاوێک: ژنان فریان بەسەر جەنگ و سیاسەتەوە نیە!

لیسیستراتە: ژنانیش هێندەی پیاوان سەرقاڵی جەنگن و نارەحەتیان دەکات. دڵنیابە ژنان دەتوانن ببنە سەرکردەی بە ئەمەکتری وڵات، زیاتر لەوەی پیاوان بوون.

دەنگی ژنێک: ئایا پیاوێک هەیە بەدەنگمانەوە بێت و ئاسودەمان بکات؟

کۆرسی ژنان: نەخێر، نەخێر، هیچ پیاوێک نیە!

دەنگی ژنێک: ئاخر بۆیە ژنان دەنگیان کردووە بەیەک تاکارێک بۆ یۆنان بکەن و لەم میحنەت و تیاچوونە ڕزگاری بکەن.

## ئێپیکۆریەکان:

ئەمانە گروپێک بوون، پەیڕەوی ڕێبازی فەلەسەفی ئێپیکێۆریان دەکرد. ئێپیکێۆر (341- 270 پ.م.) بڕوای وابوو کە گیان، هەروەک لەش لە ئەتۆم دروست بووە و لەگەڵ مردنی لەشدا، گیانیش ئەتۆمەکانی لەبەریەک هەڵدەوەشێتەوە و تێکەڵی سروشت دەبنەوە. پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە، بڕوایان وابوو کە ئاسودەیی و ئارامی گیان زۆر گرنگە و مرۆڤ دەبێت هەردەم لەو کار و هۆکارانە دوور بکەوێتەوە کە نائارامی و ئازاری جەستەیی و دەروونیی پێدەگەیێنن. دیسان بڕوایان وابوو کە، مەرج نیە بتوانرێت خۆشگوزەرانی بۆ هەمووکەسێک دابین بێت (وەک ئەوەی پلاتۆن بڕوای پێ بوو)، بەڵام گرنگە کە تۆ بتوانیت بەخۆشی بژیت. لەم بزوتنەوەیە/گروپەدا، ژنان و کۆیلەش، بە ڕێژەیەکی زۆر بەشدار بوون.

## ستۆیسیزم (300 پ.م تا 200 د.م.)

ئەمە ڕێبازێک، یان بزووتنەوەیەکی فەلسەفی یۆنانی-ڕۆمانی بوو، لە لایەن زێنۆنی قۆبروسی (334-262 پ.م.) دامەزرا. لەم ڕێبازەدا جیاوازی لە نیوان کەسەکاندا نەبووە. هەر بۆیە کۆیلەیەک و ئیمپراتۆر/قەیسەرێک وەک یەک پەیڕەوییان کردووە. سەرەتای بزوتنەوەکە لە شوێنێکدا کۆدەبوونەوە کە ڕارەوێکی پڕ پایە بوو، بۆیە بە گروپی ڕارەو/ڕەواقی ناسرابوون. کورتەی باوەڕەکەیان ئەوەبوو ((مادام مرۆڤ بەشێکە لە سروشت و بە هارمۆنی لە سروشتدا دەژی، ئیدی کە مردیش هەر

دەگەڕێتەوە ناو هەمان سروشت و شوێنێکی دیکە نییە تا مرۆڤ دوای مردن بۆی بچێت)).

بەناوبانگترین پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە ئیمپراتۆر مارکۆس ئەورۆلیۆس، کە لەساڵی (161- 180 د.م.) حوکمڕانی ڕۆم بووە. لەم بزوتنەویەدا کە نزیکەی 500 ساڵ درێژەی هەبووە، ژنان بە سەربەستی و یەکسانی لەگەڵ پیاوندا بەشدار بوون.

## تۆماس ئاکویناس (1225- 1274)




تۆماس ئاکویناس، قەشەیەکی زۆر زانا بووە. هەر لە تەمەنی پێنج ساڵانەوە ناردویانەتە، خەڵوەتگە (کلۆستەر) و تا تەمەنی چواردە ساڵان، خوێندویەتی. دواتر چۆتە زانکۆی ناپۆلی شەریعەت (تیۆلۆجی) و فەلسەفەی خوێندووە. دواتر بۆ خوێندن چۆتە پاریس. بەرهەمەکانی ئاریستۆتالیس زۆر کاری لە بیرکردنەوەی ئەم پیاوە کردووە.

تۆماس ئاکویناس، لە هەمان ڕوانگە و بۆچوونی ئاریستۆتالیسەوە، لە ژن دەڕوانێت، کە ژنان هەر بە سروشت ناتەواون (لەبەرانبەر پیاواندا)، جا ئەم وەک قەشەیەک، ئاینیش دەکات بە پاڵپشتی بۆچوونەکانی. ئەو بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەی، پەنای وەبەر بایبڵی کۆن (تەورات) بردووە. باسی داستانی «دروست بوونی ئێڤا/حەوا» دەکات. تۆماس بڕوای وایە کە خودا ژنی پلەیەک لە پیاو نزمتر خوڵقاندووە، بۆیە ئێڤای لە پەراسوی ئادەم دروست کرد. خۆ گەر ویستبای لە پیاو بەرزتر بیخوڵقێنێت، ئەوا لە کەللەی ئادەمەوە دەیخوڵقاند.

بێگومان نەشیویستووە، کە زۆر لە پیاو نزمتر بێت، دەنا لە پێی ئادەمەوە دەیخوڵقاند!

## هیگڵ (1770- 1837)

بە بڕوای هیگڵ، بەها و یاساکانی دەوڵەت دەستکردی پیاون، چونکە پیاو لە سنوری خێزان دەچێتە دەرەوە، بەڵام ژن، لە سنوری خێزاندا دەمێنێتەوە و پارێزگاری بەهاکانی دەکات.

هیگڵ بۆسەلماندنی ئەم ڕایەی، چەند دیالۆگێکی لە شانۆگەری ئەنتیگۆنە نووسینی سۆفۆکلیس، کردووە بە بەڵگە.

(پۆلینیسیس، برای ئەنتیگۆنە، دەست لەگەڵ دوژمنانی شا کریۆن تێکەڵ دەکات و دەیەوێت شا بکوژێت. هەوڵەکەی سەر ناگرێت و لە کاتی هێرش کردندا دەکوژرێت. بە بڕیاری شا، لاشەی پۆلینیسیس لە دەرەوەی شار فڕێ دەدەن تا دڕندە بیخوات، هەرکەسێکیش ئەو لاشەیە بنێژێت. سزای مەرگ دەدرێت. ئەنتیگۆنەی خوشکی، دەچێت لاشەکە دەنێژێت. کریۆنیش سزای مەرگ بەسەر ئەنتیگۆنەدا دەدات.)

ئەنتیگۆنە: ئەمە بڕیاری خواوەندەکان نیە. من هیچ بڕوام بەو داد و یاسایە نیە کە دەستەڵاتداران بۆ بەرژەوەندی خۆیان دایدەنێن! فەرموو ئێستا من لەبەردەستی تۆدام، ئایا لە کوشتن زیاتر چ سزایەکی دیکەم دەدەیت؟

کریۆن: نا، جگە لە کوشتن هیچ سزایەکی دیکەت نادەم.

ئەنتیگۆنە: چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ لە ناشتنی تەرمی براکەم زیاتر، چی دیکە بۆ من گرنگ نیە. من لەم پێناوەدا شانازی بە مەرگەوە دەکەم!

## سۆفۆکلیس (496 – 406 پ.م.)

بەناوبانگترین شانۆیی نووسی یۆنان بووە. زیاتر لە 120 شانۆگەری (تراجیدیا) نووسیوە، بەڵام تەنها 7 دانەیان ماون. یەکێک لەوانە تراجیدیای ئەنتیگۆنەیە.

## جۆن ستیوارت میڵ (1806 – 1873)

جۆن ستیوارت میڵ، لە خێزانێکی دەوڵەمەند و لیبراڵ لە ئینگلاند لە دایکبووە.تەمەنی سێ ساڵان بووە، بابی فێری لاتینی کردووە. لە تەمەنی چواردە ساڵاندا بۆ خوێندنی فەلسەفە چۆتە فەرەنسا. لەوێندەر بە

بیروباوەڕی دیموکراتی لیبراڵ و ڕادیکاڵ ئاشنا بووە. ئەمە لە نووسینەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە و گرنگی بە پرسەکانی ئاکار (ئیتیک) و دیموکراتی، داوە.

گرنگترین ڕوداوی ژیان و ئاڕاستەی بیرکردنەوەی ئەوە بووە کە لەگەڵ هاریتیت تایلۆر (1807- 1858) ئاشنا بوو. ئەم خانمە گەرچی بە مێرد و خاوەنی سێ منداڵ بوو، بەڵام لەگەڵ میلدا لە پەیوەندیەکی دڵداری ئێرۆسی پلاتۆنیدا بوو.

میڵ گەلێک کتێبی نووسیوە. زۆربەیان مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە، بەڵام کتێبی بە پاشکۆ کردنی ژنان یان «*چەوساندنەوەی ژنان*» ساڵی 1861 نووسراوە. وەک زریانێک ناوەندەکانی هزر و ڕۆشنبیریی ئەورووپای هەژاند. ئەم کتێبە بووە «*کتێبی پیرۆزی*» ژنان و بزوتنەوە فێمێنیزمیەکان. میڵ لەو کتێبەدا باس لە ئازاد کردنی ژنان دەکات و بە مەرجی بنەڕتی ڕزگار بوونی کۆمەڵی دادەنێت. میڵ بڕوای وابوو کە ژنانیش دەبێت هێندەی پیاوان ئازاد بن لە هەوڵدان بۆ خۆشگوزەرانی و خۆشبەختی خۆیان. تەوەری سەرەکی کتێبەکە لەسەر ئەو چەوساندنەوە و غەدرە مێژووییەیە کە لە ژنان کراوە.

میڵ، ماوەی چوار ساڵ (1865- 1868) ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیا بووە. لەو ماوەیەدا گەڵاڵەی یاسایەکی بۆ پێدانی مافی هەڵبژاردن و دەنگدان بۆ ژنان داوە بە پەرلەمان، بەڵام زۆرینەی پەرلەمان دژی ئەو پێشنیارە دەنگیان داوە.

## کلتور

جۆن ستیوارت میڵ:

"نابێت ڕێگە لە ژن بگیرێت هەر جۆرە خوێندنێک، یان هەر جۆرە کارێک هەڵبژێرێت. دەبێت ژن ئازاد بێت لە هەڵبژاردن و کردنی هەر خوێندن و کارێک کە لەگەڵ زەوق و توانایدا دەگونجێت"

## ڕاڤە

لیبراڵ، لیبراڵیزم:
لە وشەی «لیبێر»ی لاتینی وەرگیراوە (ئازاد). لێبراڵیزم فەلسەفە، یان ڕێبازێکی سیاسییە کە لەسەر بنەمای ئازادی تەواوی تاکە کەس دامەزراوە. ئەم فەلسەفەیە ئازادی بە گشت کەسێک ڕەوا دەبینێت و دەوڵەت لەهەمبەر دەستەبەرکردن و پاراستنی ئەو ئازادیە بۆ تاکەکانی کۆمەڵ بەرپرس دەکات.

وانەی 7

دەربەندی پەپوولە

لێرەم و بای خەونم
زەمانێ تۆو ئەکات
کە هێشتا زەمینی لە دایک نەبووە.
لێرەم و ڕوانینم
کەناری دوا ڕۆژێ سەوز ئەکات
کە هێشتا بارانی لەدایک نەبووە.
ئەم خەونە
پەنجەرەی ئایندەی مێژووە.
من چاوم
پێش تیشکی ئەمڕۆکە و
بیستنم
پێش دەنگی ئێستاکە کەوتووە.
دۆزەخی ئەندێشەم
گوڵی وای تیا ئەڕوێ
کە هێشتا ئەم عەردە
بەچاوان نەیدیوە.

بێ کەسیم ڕووت نیە
تا ئەمرێ پۆشاکی ڕەشتانی بەش ئەکات.
تینوێتیم بێ کانی و ئاو نییە
تا ئەمرێ سیروانی چاوتانی بەش ئەکات.
تەنیاییم بێ دەنگ و کپ نییە
تا ئەمرێ هاواری ماڵتانی بەش ئەکات.
دۆزەخم بێ کزەی با نییە
تا ئەمرێ هەناسەی ساردتانی بەش ئەکات.

تێبینی بۆ مامۆستا:
ئەم دوو پارچە شیعرەی شێرکۆ بێ کەس، لە دیوانی دەربەندی پەپوولە.لاپەڕە 42، 43 و 108. ستۆکهۆڵم 1991، چاپ و پەخشی ئاپێک، ستۆکهۆڵم، سوید، وەرگیراوە.

وانەی 7

پرسیار

1- ئەو وشانەی لەو دوو پارچە شیعرەدا بەکار هێنراوون، گشتمان دەیانزانین و لە مانا و ئامارەکانیشیان تێدەگەین. ئایا شیعر نووسین تەنها وشە ڕیزکردنە؟
2- ئایا جوانی و هێزی ئەو شیعرانە، لە وشەکاندایە، یان لەو مانا و مەبەستانەی، کە وشەکانیان بۆ بەکارهاتووە؟
3- ئایا شێرکۆ لە ڕێگەی وشەکانەوە دەستەڵات و زاڵێتی خۆی بەسەر شیعردا سەپاندووە، یان لە ڕێگەی شیعرەوەیە ئەو کارەی کردووە؟
4- ئایا شێرکۆ دەیەوێت، لە ڕێگەی شیعرەوە مێژوویەکمان بۆ تۆمار بکات، یان مێژوویەکمان بە شیعر بۆ دەگێڕێتەوە؟
5- کاتێک شێرکۆ دەنووسێت «لێرەم و بای خەونم زەمانێ تۆو ئەکات کە هێشتا زەمینی لەدایک نەبووە». ئایا ناکەوینە بیری ئەوەی کە «زەمین/شوێن» بەبێ «زەمان/کات» نابێت، یان بە پێچەوانەوە زەمان/کات، بەبێ زەمین/شوێن نابێت؟
6- ئایا هەموو کاتێک، ئەوەی مەبەستتە دەتوانیت دەریببڕیت؟
7- گەر نەتوانیت، مەبەستت دەربڕیت و پەیامەکەت بگەێنیتە کەسانی دیکە، هۆکەی ناشارەزاییتە لە زماندا، یان هەژاریتە لە وشەدا؟

8- ئایا شارەزایی لە زمان و زەنگینی لە وشەدا، یان تێگەیشتن و گرنگی باس و بابەت و پرسێک، مەرجی سەرەکین بۆ دەربڕین و گەیاندنی پەیام و مەبەست؟
9- بە بڕوای تۆ، ئەو دنیایەی شێرکۆ لەم شیعرەدا وێنای دەکات، پەیوەندی بە جیهانە بەرزەکە/ جیهانی ئایدیای پلاتۆنەوە هەیە؟
10- گەر زیندەوەرەکانی دیکە بیانتوانیایە بئاخڤن، ئایا زیندەوەری هەر وڵات و کیشوەرێک بە زمانێکی جیا دەپەیڤی، یان گشتیان هەر هەمان زمانیان بەکار دەهێنا؟

کلتور

گۆران (1904- 1962) :

هەرچەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە نێو چوارچێوەی هەڵبەستم!
لێک دانەوەی دەروون، قسەی زمانم
بۆچی وەها دوورن لەیەک؟ نازانم!

دیوانی گۆران، بەرگی یەکەم ل 121، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، 1980

لودویک ویتگنستەین (1889- 1951) :
" ئەوەی نەتوانین باسی بکەین، دەبێت لێی بێدەنگ بین."
" وشە کاتێک مانای هەیە، کە لە زماندا بەکار بهێنرێت."

وانەی 7

## لینگویستیک (زمان)

زمانی پڕمانا و مەبەست، وێنەیەک، یان، ئاوێنەیەکی دەوروبەرەکەمانە.بەهۆی زمانەوە دەتوانین "شتە" ماتریالّیەکانی دەوروبەرمان و "ئەندێشەی" هەستەکانمان بەرجەستە بکەین. بۆ ئەفراندنی زمان پێویستمان بە وشە هەیە. کاتێک کە دەڵێین کتێب، دەزانین مەبەستمان چیە و چەمکی کتێب چی دەگەیێنێت. ئیدی با کتێبەکە، کتێبی شیعر کتێبی کیمیا، بێت.کاتێکیش کە دەڵێین مێز، دیسان دەزانین مێز چیە و چەمکە گشتیەکەی مێز چی دەگەیێنێت، ئیدی با مێزی تەختە، مێزی ئاسن، یان لە هەر ماترێالّێکی دیکە درووستکرابێت. بێگومان بۆ بەرجەستەکردنی ئەم دوو شتەی دەیبینین، دەبێت لە فۆرمی ڕستەدا پەیوەندییەکیان لە نێواندا دروستبکەین. کەدەڵێین: ((کتێبەکە لەسەر مێزەکەیە)) لەم ڕستە پریدکاتیڤ/گوزارەییەدا بەیارمەتی ئامرازی پەیوەندی/پرۆپۆزیشن (لەسەر) وێنەی حالّەتێک/دۆخێک نیشان دەدەین، کە لە ژینگەی دەوروبەرماندایە، ئەویش بوونی کتێبەکەیە لەسەر مێزەکە.

ئایا هەمان ڕستە، مانای ئەوش نادات، کە مێزەکە لە ژێر کتێبەکەدایە؟ گەرچی ئێمە ئەوەشمان نە درکاندبێت. بێگومان دەبێت کەسێک کتێبەکەی لەسەر مێزەکەی دانابێت، ڕەنگە کەسێکیش بیەویت بیخوێنێتەوە و پرسیاری کرد بێت کە کتێبەکە لە کوێدایە، یان،..... ئیدی بەم شێوەیە دەکرێت بە سەدان ڕستە، بە هەزاران وشە دەربارەی ئەو کتێبە بنووسین، یان بڵێین و چەندەها دۆخ و سیفاتی تایبەتی و گشتی کتێب و مێزەکە باس بکەین. ئەم ئەزمونە بۆ دەربڕینی ئەندێشە هەستەکیەکانیش دەبێت. کاتێک دەڵێین « خۆشەویستی پیرۆزە! »

مرۆڤ تاکە زیندەوەرێکە، کە دەتوانێت لە ڕێگەی زمانەوە، تەعبیر لە بیر و بۆچوون و هەست و سۆزی خۆی بکات. دیسان هەر بەهۆی زمانەوە، دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکەشدا ببەستێت و ڕەهەندێکی فەلسەفیش بە مێژوو ببەخشێت.

گرنگی زمان لەوەدایە، کە نەک تەنها دەتوانین باس لە سێ کاتی جیاواز، ڕابوردوو، ئێستا و داهاتوو،بکەین، بەڵکو دەتوانین دنیای نادیاریش، لە ڕێگەی زمانەوە وێنا بکەین.
زمان کاتێک کە تەنها زمانی ئاخاوتن/گفتوگۆیە، لە قاوغە سروشتیەکەی خۆیدا دەمێنێتەوە، بەڵام کاتێک زمان دەگاتە ئاستی نووسین، ئیدی دەبێتە کلتور.

## وێناکردن(ئیلوسترەیشن)

لە ژیانی ڕۆژانەماندا، لە بەکارهێنای زماندا، ڕووبەڕووی کێشەیەک دەبینەوە، کە لە لێنگویستیکیدا بە (ئیلوسترەیشن) وێناکردن ناو دەبرێت. دەکرێ ئەم وێناکردنە بکەین بە دوو بەشەوە

### بەشی یەکەم : وێناکردنی ناپەسەند.

لە وێناکردنی ناپەسەنددا، ئاخێوەر وێنایەکی ناپەسەندی بابەتی باسکراو دەکات. زۆربەی وێنا ناپەسەندەکان، زمانێکی نەنگ، یان نزم دروست دەکەن و تاڕادەیەکی زۆریش ڕەنگدانەوەی ئاستی تێگەیشتنی ئاخێوەر بەدیار دەخات. نموونە:
لێوی دەڵێی ئیستقای یەک ڕەنگە، گەرنی جانووماینێکی شۆخ و ڕەنگینە
زاری دەڵێی قوتووی شیرنیاتی، ددانی هەر دەڵێی مروارینە.
(لە کتێبی گەنجی سەربەمۆر، ئەحمەد بەحرەکە، ل. 88. بەیتی حاجی سالە تەورە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی 2000)
وێنا کردنی گەردنی کچێک، بە گەردن/ملی ماین و وێناکردنی دەم بە قوتوو، وێنا کردنێکی ناپەسەند و نزمە، لە هەمان کاتیشدا بێ دەستەڵاتی ئاخێوەر لە وێنا کردندا نیشان دەدات.

### بەشی دووەم : وێناکردنی پەسەند.

لە وێناکردنی پەسەنددا، ئاخێوەر هەوڵ دەدات وێنایەکی پەسەند و جوانتر بدات بە بابەتە وێناکراوەکە و نزیکیەک لە نێوان بابەتی ستایشکراو و ستایش کردنەکەدا، پەیدا بکات. نموونە:

ساڵح دیلان، لە کۆپلە شیعرێکدا، بە خەیام، شاعیری گەورەی فارس، دەڵێت:

هەستە ئەی سەر شێت
کوشتەی گڕی تەڕ

گڕی تەڕ، وێناکردنێکی پەسەند و جوانە بۆ شەراب. لە نێوان سوری شەراب و گڕدا،لێکچوون هەیە و لە نێوان گەرمی گڕ و گەرمی شەرابیشدا لێکچوون هەیە.

## زمانی گشتی و زمانی تایبەتی

لە فەلسەفەی لێنگویستیکدا، زمان دەکریت بە دوو بەشەوە، گشتی و تایبەتی.
زمانی گشتی ئەو زمانەیە، کە ئەندامانی کۆمەڵێک، یان گەلێک پێی دەدوێن. بۆ نموونە: زمانی کوردی، زمانی نەرویجی.
زمانی تایبەتی ئەو زمانەیە، کە ئەندامانی دەستە و تاقم وتوێژێکی تایبەت لەناو هەمان ئەو کۆمەڵە، یان گەلەدا پێی دەدوێن و تەنها تایبەتە بەو توێژ و تاقمەوە. بۆ نموونە: زمانی تایبەت بە پزیشکی و پزیشکان، فەلسەفە و فەیلەسوفەکان.

## زمان و دەستەڵات

زمان پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە دەستەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتییەوە هەیە.
تۆ وەک خوێندکارێکی تەمەن 14- 15 ساڵان، کاتێک بەرانبەر باوکت، یان مامۆستاکەت، دەپەیڤیت، هەمان وشە و دەستەواژە بەکار ناهێنیت، کە لەگەڵ هاوڕێکانتدا یان خۆشەویستەکەتدا بەکاری دەهێنیت. ئەم شێوازی ئاخافتن گۆڕینە، تەنها پەیوەندی بە دەستەڵات و پێگەی ئەو کەسانەوە هەیە کە لەگەڵیاندا دەپەیڤیت.

## زمان و ئاگامەندی

« من سکم دێشێت»، کاتێک کە تۆ ئەم ڕستەیە دەخوێنیتەوە، یان دەبیستی، بەگوێرەی ئەو ئاگامەندی و زانیارییە لە پێشینەیەی کە هەتە، دەزانیت سک چیە و دەشزانی ئێش چیە.بەڵام تۆ چۆن بزانی کە من بەڕاست سکم دێشێت.

ئایا هەستکردن بە ئێش و ئازار، لە لای من و تۆ بە تەواوی لەیەک دەچێت؟

ئایا تۆش، کە سکت ئێشاوە، ئازارەکەت هێندەی ئەوەی من بەتین بووە؟

ئایا گەر تۆ ئێستا بەرانبەرم بوویتایە و هێمای ئازارت لە ڕوخسار و جەستەمدا ببینیایە هەر هەمان پەرچەکردارت دەبوو وەک ئەوەی ئێستا کە لەو سێ وشەیەدا باسی ئێش و ئازاری سکی من دەخوێنیتەوە؟

وەک لودویگ ویتگنستەین دەڵێت: "لەوانەیە ڕستەیەک زۆر بێ مانا بێتە بەرچاو بێ مانابیەکەشی کە لە ڕووکەشیدا دیارە، لە قووڵایی هەمان ڕستەدا خۆی حەشارداوە.'

لە سەرەتای مێژووی فەلسەفەوە، هەر لە پلاتۆنەوە، تا کانت، فەیلەسوفەکان بە کێشەی زمانەوە سەرقاڵ بوون. بەڵام لە ناوەڕاستی ساڵانی 1700 وە، ئیدی بە چڕی باس لە لێنگویستیک دەکرێت.

## یۆهان جیۆرج هامان (1730- 1788)

هامان ئاڵمانیە و هاوسەردەمی کانت بووە. هامان گوتویە: "لەبەر ڕۆشنایی زماندا، (مەبەست لە واتابەخشی زمانە) کە هاوکات، گیانەکی/ هەستەکییە. کە لە دەنگ و حەرف پێک دێت. مرۆڤ پەیوەندییەکی گیانەکی/ هەستەکی لەگەڵ جیهاندا دەبەستێت."

لودویگ ویتگنستەین (1889- 1951)
" فەلسەفە گشتی، ڕەخنەی زمانەوانییە. زمان بەرگ و پۆشاکی هەموو بیرێکە."
بەم بۆچوونەوە، ویتگنستەین گرنگی بە زمان و کاریگەرێتی زمان داوە. ویتگنستەین،
لەساڵی 1889 لە نەمسا لە دایکبووە. فەلسەفەی لە لای هوسرڵ خوێندووە. دواتر چۆتە ئینگلاند. ساڵانی (1939 – 1947) بووە بە پرۆفیسۆر، لە زانکۆی کامبریج.
ساڵی 1921 کتێبە بەناوبانگەکەی «ترەکتاتوس» بە زمانی ئاڵمانی نووسی و نزیکەی 10 ساڵ (1929- 1939) کاری لەسەر هەمان تیۆری ناو ئەو کتێبە کرد.
لودویک ویتگنستەین گتوویەتی : "کێشەی فەلسەفی کاتێک سەرهەڵ دەدات، کە زمان(( وێڵمان دەکات))، ئیدی سەرگەردان دەبین و ڕێگە نادۆزینەوە. دروست ئا ئەمەیە کە چەمکە فەلسەفیە گرنگەکان، وەک دەستەواژەی زمانەوانی نابینین و تێناگەین."
لە سەدەی بیستدا بەتایبەتی لە فەرەنسا- زانکۆی سۆربۆن، کۆمەڵیک فەیلەسوف، زۆر سەرقاڵی فەلسەفەی لێنگویستیکی بوون.

جاکویس دێرردا ( 1930 - 2004)
دێرریدا، خاوەنی تیئۆری (دێکۆنسترەکشن). لەسەر ڕێبازی مێتافیزیکی، هەر لە پلاتۆنەوە، بۆ دێسکارت، تا مارتین هایدیگەر، ڕێبازە فەلسەفیەکەی خۆی دارشتووە.
دێرریدا، بۆ ڕاڤەکردنی فەلسەفەکەی، پەنای وەبەر چەمکی« هێما/ ئامازە» بردووە. لەم بەکارهێنانەی ئامازەیەدا، کە بە « مێتافیزیکی ترادیشیۆنی» ناوی دەبات، زمانی نووسین دەخاتە بن زمانی ئاخاوتنەوە. بە بڕوای دێرریدا، زمانی ئاخاوتن، بوونی ڕاستەوخۆیی تێدایە، بەڵام زمانی نووسراو، ئەو بوونەی تێدا وون، یان نادیارە.

بە واتایەکی دیکە، زمانی ئاخاوتن، زیندووییەکی تێدایە، کە لە زمانی نووسیندا ئەو زیندووییە، بەو زەقییە نابینرێت.
نموونە: کاتێک، کە دەمقالێ/گفتوگۆیەکی توند و بە دەنگی بەرز، لە نێوان دوو کەسدا دەبیستیت، دواتر هەوڵ بدە کە دیالۆگەکانی ئەو دەمەقاڵێیە بنووسیتەوە، بزانە هەمان توڕەیی، گەرمی، توندی، یان هەستی، دەمەقالێیە، یان ڕووداوە ڕاستەقینەکەی تێدایە.

ڕاڤە
لینگویستیک: زانستی زمان

کلتور

ئەندریا نییە، نووسیوویەتی: "کاری زمان ئەوە نیە، کە فۆرمە ناوەکی/نادیارەکان، دەستنیشان بکات، بەڵکو دەبێت ئاماژە بە فۆرمە دەرەکیەکان بکات و بە مەبەستی پێدانی زانیاری دەربارەی بابەتێک ئاڕاستەیان بکات. تا دەرئەنجام بتوانین پەیوەندی لە نێوان زمان و بابەتدا بدۆزینەوە."
لە کتێبی فەلسەفەی زمان بەشی یەکەم «زمان چیە؟» پەخشی بلاک ویڵ ساڵی 1989، ئۆکسفۆرد، بریتانیا.

یۆرگن هابەرماس (1929 لە دایک بووە)
بە بڕوای هابەرماس، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بۆیە، هۆشیارانە (مرۆڤانە)یە چونکێ تاکەکان دەزانن چۆن پەیوەندی و دانوساندن لەگەڵ یەکدیدا بکەن.
لە کتێبی «گشت ئەوەی دەتوانم بیڵێم» نووسینی «ئێلی گلومنس» ئۆسلۆ، کاپێڵ 2001

لیستی ئەو کتێب، گۆڤار و وتارانەی کە دەکرێت بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی باسەکان و فەیلەسوفەکان کەڵکیان لێوەربگیرێت.

پۆزش، ئەفلاتۆن
نووسینی: بنیامین جوێت، وەرگێڕانی : ئاوات ئەحمەد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی 2002

گرفتی ئاکاری و چارەسەرکردنی لای ئەفلاتۆن
نووسینی، وێل دیورانت، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە، عوسمان ئەحمەد
گۆڤاری ئایندە، ژمارە، 65، ساڵی 2006، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
لاپەڕە، 173 تا 177.

فەرهەنگی سۆفیا
نووسینی: ئۆتە بیوهمە، وەرگێڕانی لە دانیمارکیەوە؛ بەهرۆز حەسەن
دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی 2003

بنەماکانی فەلسەفەی شیکردنەوەی مەنتیقی، نووسینی؛ د. حەمید عەزیز
دەزگای چاپ و پەخشی موکریان، هەولێر، ساڵی 2005

دیکارت، نووسینی: پۆڵ ستراترن، وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد
دەستگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، 0000

بوونگەرایی، نووسینی، سامان غەفور
گۆڤاری هومانیزم، ژمارە 1 لاپەڕە 4، سلێمانی، حوزەیرانی 2005

کیرکەگۆر، سەرەتایەک بۆ ژیان و فەلسەفەکەی، نووسینی، پۆڵ ستراترێن،
وەرگێڕانی، ئازاد بەرزنجی، دەزگای سەردەم.

مارتین هایدگەر، نووسینی، کۆمەڵێک نووسەر، وەرگێڕانی، ئیسماعیل کوردە.

گفتوگۆیەک لەگەڵ هایدگەردا، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە، د. محەمەد کەمال
زنجیرە کتێبی گیرفان، ژمارە 71، سلێمانی 2005

## ئەو سەرچاوانەی کە بۆ نووسینی ئەم کتێبە کەڵکی لێوەرگیراوە:

### سەرچاوە کوردیەکان:

ئۆنتۆلۆجی بنەڕتی و بوونی مرۆڤ.
د. محەمەد کەمال، چاپخانەی ڕاز، سلێمانی، 2000
فەلسەفەی هیگڵ،
د. محەمەد کەمال، دەستگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی 2001
سارتەر و خوێندنەوەیەکی نوێ،
د. محەمەدکەمال، دەستگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی 2003
بوون و داهێنان،
د. محەمەد کەمال، دەستگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی 2004
نهێلزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە،
د. محەمەد کەمال، دەستگای چاپ و پەخشی سەردەم سلێمانی 2005
کۆتایی خۆ و گەڕانەوە بەرەو ناچارەکی لە بۆچوونەکانی پاش تازەگەریدا،
د. محەمەد کەمال، گۆڤاری ئاینده، ژمارە 55، سلێمانی، 2004




فەلسەفە لە قوتابخانەدا، کەریم مستەفا، گۆڤاری ئاینده. ژماره 59، ،
ساڵی 2005، لاپەڕە 96 تا 103

## سەرچاوە نەرویجییەکان

Filosofi, Livssyn og Etikk,
Erik Brøntveit og Knut Duesund.
Fag Forlaget, Oslo 2002, ISBN 82-7674-731-0

Filosofi Leksikon,
Zafari forlag, Oslo 1996, ISBN 82-742-0001-5

Alt Jeg kan si,
Eli Glomns,
Cappelens Forlag, Oslo 2001, ISBN 82-02-19658-2

Tenkepauser,
Hilde Bondvik og Inge Bostad,
Akribe Forlag, Oslo 2000, ISBN 82-790-008-1

La Barna Filosofere,
Beatte Børresen og Bo Malmahester,
Høyskole Forlaget, Kristiansand 2003, ISBN 82-7634-482-8
Tenknings historie, 1,
Anfinn Stigen,
Gyldendal Norsk Forlag, Gjøvik 2002, ISBN 82-05-14663-2

Vesten store tenkere,
Trond Berg Erikson,
Narayana Press, Denmark, 2002, ISBN 82-03-22715-5

I Sokrates, fotspor,
Helge Svare,
Pax Forlag A/S Oslo 1997, ISBN 82-530-1820-7

Filosofi,
Bryan Magee,
Teknologisk Forlagrt, Oslo 2002,

Det Annet Kjønn,
Simone De Beauvoir,
Oversatt av Bentte Christensen,
Pax Forlaget A/S Oslo, 2000, ISBN, 82-530-2303-2

Hva er språk,
Helene Uri,
Universitetsforlaget AS, Oslo 2004, ISBN 82-15-00455-5

Kjønnsperspektiver i filosofi,
Linda M. Rustad og Hilde Bondevik,
Pax Forlaget A/S, Oslo 1999, ISBN 82-530-2036-8

Verdens Religioner,
Huston Smith,
Hilt & Hansteen, Oslo 1995, ISBN 82-7413-324-2

سەرچاوە ئینگلیزیەکان

Introducing Philosophy
By, Dave Robinson and Judy Groves
Totem Books, 2004 USA, ISBN 1-84046-576 X

Philosopy of Language,
Edited by Andrea Nye
Blackwell Publishers Ltd. 1998, ISBN 0-631-20601-9

